

# گۆڤاری کۆمپیوتەر



ژمارە ١٢

(ئـایار) ی ٢٠٠٦

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت - وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەکات

- هەنگاوە گرنگەکانی دروست کردنی سایتێکی بازرگانی.
- گەڕاندنەوەی زانیاریەکان لەسەر سی دی تێك چوو.
- چی بکەین پێش ئەوەی بچینە سەر تۆڕی ئینتەرنێت.
- ئەو ڤایرۆسانەی بە فۆرماتیش لەناو ناچن.
- ریپۆرتاژێك سەبارەت بە تێپەڕبوونی سالێك بەسەر دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤاری کۆمپیوتەر.






































پاشکۆی گۆڤار : سی دی تایبەت بە گۆڤارەکە

هەولێر - ٢٠٠٦




# گۆڤاری کۆمپیوتەر

ژمارە ١٢
ئایار- ٢٠٠٦

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت ـ وەزارەتی رۆشنبیری دەری دەکات


**تێبینی : هەموو پەیوەندیەکان لەرێگای سەرنووسەرەوە دەبێت**


**ناونیشان :**
هەرێمی کوردستان/ عێراق ـ هەولێر . دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری. شەقامی شەست مەتری نزیک هۆلی زەرد. بۆ هەر پێشنیارو سەرنجێک یان ناردنی بابەتێک .
پەیوەندی بکەن بەسەر نووسەرەوە بەم ناو نیشانە . :
دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری ـ بەرێوەبەرایەتی کۆمپیوتەر ـ یان بە ژمارە تەلەفۆنی: **2232721**
مۆبایل : **0750 4618045**
یان پۆستی ئەلکترۆنی :
E.mail: computer_magazine_2005@yahoo.com
aras_co_center@yahoo.com



**خاوەنی ئیمتیاز**
**وەزیری رۆشنبیری**

**سەرنووسەر**
**ئاراز مەولود رەشید**

**بەرێوەبەری نووسین**
**فاخر مەحمود میرزا**

**بەرێوەبەری هونەری**
**یاسین عاصم**

**دەستەی نووسەران**
**رێناز نەردەلان بەکر**
**کاوە سلیمان**
**شاخەوان عمر حسن**

**دیزاینی بەرگ**
**عزیز ئەسعەد سمایل**

**سەرپەرشتی چاپ**
**ئەهرۆ مەحمود**




ئاگاداری :
بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە بابەت ئەنێرن بۆ بلاو کردنەوە لەگۆڤارەکەمان با بەتەواوی ئاماژە بکەن بەناونیشان و سەرچاوەی ئەو بابەتەی کە دەینێرن بە پێچەوانەوە ئێمە بەرپرسیار نین لە هیچ لێپرسینەوەیەك.



# پێرست


nero
CD/DVD
Copy and Backup
Copy CD
Copy DVD
Back up Files
Restore Backups


macromedia






Anti
Scan Now


Mozilla


Microsoft Windows
Movie Maker 2

# ئەو بەرنامانەی کە لە ناو سیدی ژمارە ١٢ دا هەیە

ئا: هێرش اسماعیل

## بەشی دژە ڤایرۆس ANTI VIRUS




کۆمەڵێک دژە ڤایرۆسی بەهێز بۆ لە ناو بردنی هەموو جۆرە ڤایرۆسێک .

KASPERSKY ANTI-VIRUS PERSONAL 5.0.388
MCAFEE VIRUSSCAN 2006
PANDA TITANIUM ANTIVIRUS 2006
ZONEALARM SUITE V6.0.667
NENTENST

## بەشی فۆتۆ و بەرنامەکانی وێنە GRAPHIC TOOLS



کۆمەڵێک بەرنامەی تایبەت بە فۆتۆ و دەست کاری کردنی وێنە .

ACD SEE 8
AXIALIS
ICONWORKSHOP 5.0
GRAPHIC CONVERTER 6.3
MULTIMEDIA BUILDER 4.9.7
PHOTO EFFECTES
PICASA2-CURRENT
POWER WEBSITE BUILDER V1.5.0
PROSHOW 2.5 GOLD
RIGHT CLICK IMAGE CONOVER
WEB PAGE MAKER V1.4 +CRACK

## بەشی فلاش FLASH TOOLS



کۆمەڵێک بەرنامەی فلاش کە دەتوانن شێوەی وەکوو فلاشی پێ درووست بکەن و لە نێوانیاندا بەرنامەی حازر و نموونەی ئامادە کراو .

FLASH PLAYER 8
LIVESWIF 2.1
SWF EXTRACTOR 2.2
SWF QUICKER 1.6
TEXT-OSTERONE 1.003

## بەشی ئەنتەرنێت و بەرنامەکانی گفت و گۆ کردن INTERNET TOOLS



کۆمەڵێک بەرنامەی تایبەت بە ئەنتەرنێت و بەرنامەکانی تایبەت بە چات کردن .

AVANT BROWSER 10.1 BUILD 32
DALEL 2006
DSL SPEED V3.2
G MAIL
GOOGL TALK NEW
INCREDIMAIL XE PREMIUM 4.00 BUILD 2116 BETA
INTERNET DOWNLOAD ACCELERATOR V4.41
INTERNET DOWNLOAD MANAGER 5.01 BUILD 2
MOZILLA FIREFOX FOR WINDOWS 1.0.7
MSN EMOTICONS INSTALLER V1.2
NETSPEED BOOST_TRIAL 3.98
OPERA 9.0 PREVIEW 1
PROXI FIER NEW
WEB TRANSLATOR
YAHOO MESSENGER 7.437

## بەشی سیدی و کۆپی CD TOOLS

کۆمەڵێک بەرنامەی تایبەت بە کۆپی کردنی سیدی و بەرنامەی ئەرشیف کردنی سیدی .




ALCOHOL 120% 1.9.5.3105
APOLLO DVD COPY V 4.5.3
CLONE CD V 5.2.6.1
VIRTUAT CLONEDRVE V5.1.1.1
WTM CD POTEC 1.7



## بەرنامەكانی دەنگ و دەنگ و ڕەنگ MULTIMEDIA

كۆمەڵێک بەرنامەی تایبەت بە دەنگ و دەنگ و ڕەنگ.




DIVX PLAYER 6.0 NEW
HERO VIDEO CONVERTER 2.7.6
JETAUDIO V6.21 PLUS
VX
SUPER DVD RIPPER 1.90
WINAMP5111_FULL_EMUSIC-7PLUS
WINDOWS MEDIA PLAYER 10.0 ARABIC
WINDOWS MEDIA PLAYER 11 DEMO
XINGMPEG PLAYER 3.3

SPEED GEAR 3.01
STREAM ANYWHERE10
TV TOOL.V9.7
WIN RAR 3.51
WIN ZIP 10.0
WIN ACE 2.6 BETA 1
XOFT SPY V4.15.117

## بەشی مۆبایل MOBIL TOOLS




كۆمەڵێک بەرنامە و وێنە و نامەی ئامادە كراو و هەواڵی نوێی تایبەت بە مۆبایل .

MASSEGES
NEWS
PHOTOES

PC PROGRAM
PROGRAM 6600
DARK
MOBILE DATA BASE
MOBILE MEDIA BROWSER V2.5.1 NEW
MOBILE MEDIA MAKER SONY ERICSSON V1.2
OXYGEN PHONE MANAGER II FOR NOKIA PHONES
SIEMENS MOBILE CONTROL
SMART MOVIE CONVERTER (SERIES 60) 2.63
UNMAKESIS

## SPECIAL TOOLS بەرنامەكانی تایبەتی

كۆمەڵێک بەرنامەی تایبەت بە كۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت .




ACEMONEY 3.73
ADDREMOVE
ADOBE READER 7.5
AGELONG TREE
ALWASSET
CLOCK
MBROLATOOLS311
MQREEB
SAT

## PHOTOS وێنە

كۆمەڵێک وێنەی قەبارە گەورە كە دەتوانن لە بەرنامەكانی دەست كاری كردنی وێنە بەكاریان بێنن .



3D
ANIMAL
ARTIST
CARS
COMPUTER
DIGITAL
FUN PHOTOS
KIDS
MOBIL
NATURES
WAS

## بەرنامەكانی هەمەڕەنگ TOOLS

كۆمەڵێک بەرنامەی هەمەڕەنگ و هەمەجۆری تایبەت بە كۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت .



CRACK SERCH
ERROR DOCTOR 2006
MAGIC UTILITIES 2005 3.60
NVIDIA 81.85
PASSWORD SAVER 2.2.6
RECOVER MY FILES 3.80
REGISTRY CLEAN EXPERT V3.57
REGISTRY WASHER V1.3.8

## ئاراز مەولود ڕەشید سەرنووسەری گۆڤاری کۆمپیوتەر

# بەبۆنەی ساڵێک بەسەر دەرچوونی گۆڤاری کۆمپیوتەر بەشێکی تایبەت بە پرسیارو وەڵام دەکەینەوە

سازدانی دیمانە:
ڕێناز حەوێزی



**بەبۆنەی تێپەر بوونی ساڵێک بەسەر دەرچونی گۆڤاری کۆمپیوتەر سەرنووسەری گۆڤاری کۆمپیوتەر بەم شێوەیە سەرنج و پێشنیارەکانی خۆی سەبارەت بەگۆڤارەکە خستە ڕوو .**

**پ/بەڕێزتان وەکوو سەرنووسەری گۆڤاری کۆمپیوتەر پەیامتان چییە بە بۆنەی بەسەر چوونی ساڵێک بەسەر دەرچوونی گۆڤارەکە ؟**

*/ سەرەتا بەم بۆنەیەوە دەست خۆشی لە یەکە بەیەکەی ستافی گۆڤارەکە دەکەم و لە ناخی دڵمەوە هیوای تەمەن درێژیان بۆ دەخوازم و هیوای تەمەن درێژی بۆ گۆڤارەکەش دەخوازم و هەر بەم بۆنەیەوە حەز دەکەم خوێنەرانی بەرێز دڵنیا بکەمەوە لەوەی کە لەمەودوا گرنگی زیاتردەدرێت بەو گۆڤارە و هەوڵ دەدەین باشترین خزمەت پێشکەش بکەین بۆ بەرەو پێش بردنی زانستی کوردی وەک چۆن بەردەوام هەوڵ و کۆششی خۆمان تەرخان کردوە بۆ خزمەت گەیاندن لە بواری زانستی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت و من بەش بە حاڵی خۆم دەبینم کە هەوڵ و ماندووبونمان بە فیرۆ نەچووە، چونکە دەبینین کە گۆڤارەکە سودیکی باش دەگەیەنێت بە هەموو توێژەکانی ئەم کۆمەڵگایە هەر لە قوتابی و مامۆستا و ئەندازیار و پزیشک و فەرمانبەران و کارمەندانی دەزگاکان و هەموو چینەکانی تری کۆمەڵگا بە تایبەتیش زانکۆ و پەیمانگاکان بۆیە هەردەم بە خۆشحاڵیەوە کارەکان دەکەین .

**پ/سەرنج و پێشنیارەکانت بۆ گۆڤارەکە ؟**

*/ دیارە هەندێک شت هەیە پێویستە باسی بکەین بە تایبەتی لەم کاتەدا

که ئێستا له شارەکانی تری هەرێمی کوردستاندا خەڵکانێکی یەکجار زۆر گلەیی ئەوەمان لێ دەکەن کە گوایە گۆڤارەکەیان دەست ناکەوێت یان باسی گرانی نرخی گۆڤارەکە دەکەن لە شارەکانی سلێمانی و دهۆک سەبارەت بەوەی کە خەڵکێکی زۆر گۆڤارەکەیان دەست ناکەوێت پێم باشە خوێنەرانی بەڕێزئەوە بزانن کە ئەو گۆڤارە بە تیراژی ١٥٠٠ دانە چاپ دەکرا تا ژمارە ١١ کە مانگی ڕابردوو بە چاپمان گەیاند ئەو تیراژە دابەش دەکرایە سەر هەموو پارێزگاکانی هەرێمی کوردستان بەقەزا و ناحیەکانی سەر بە پارێزگاکانیش بۆیە دەتوانم بڵێم ئەو تیراژە بەشی ئەو هەموو داواکاریە هاوڵاتیان ناکات بۆ گۆڤارەکە کە لە هەموو ناوچەکانی هەرێمەوە هەیە بەڵام لەم ژمارەیەوە واتا ژمارە ١٢ بڕیارمان داوە کە تیراژی گۆڤارەکە بکەینە ٢٠٠٠ دوو هەزار دانە بۆ ئەوەی بتوانین گۆڤارەکە بکەوێتە دەست خەڵکێکی زیاتر، سەبارەت بە گرانی نرخی گۆڤارەکەش لە شارەکانی سلێمانی و دهۆک کە زۆر جار پەیوەندیمان پێوە کراوە بە ڕێگای تەلەفۆن یان بە ڕێگای پۆستی ئەلکترۆنی کە گوایە لە سلێمانی ئەو گۆڤارە بە نرخێکی گرانتر دەفرۆشرێت بەڵام من لێرەوە دەڵێم هەر خوێنەرێک کە دەچێت بۆ کڕینی ئەو گۆڤارە با سەیرێکی پشتی گۆڤارەکە بکات ئێمە نرخی گۆڤارەکەمان لە بەرگی پشتەوەی گۆڤارەکە نووسیوە کە نرخی ١٥٠٠ دینارە لەگەڵ سیدیەکەی واتا گۆڤارەکە بە سیدیەوە بەو نرخەیە و دەبێت کتێبخانەکان بەو نرخە بیدەن بە خەڵکی ئینجا ئەگەر کتێبخانەکان نرخێکی گرانتر دابنێن دەبێت خوێنەر ڕازی نەبێت و لە نرخی دیاری کراو زیاتر نەدات بە خاوەنی کتێبخانە ئێمە لە لایەن خۆمانەوە هەوڵمان داوە لە ڕێگای کارمەندەکانی گۆڤارەکەوە ئەو کتێبخانانە ئاگادار بکەینەوە لەوەی کە زیاتر لە نرخی دیاری کراو وەرنەگرن بەڵام ناتوانین بەردەوام چاودێریان بکەین بۆیە باشترین ڕێگا ئەوەیە کە خوێنەر لە پارەی دیاری کراو زیاتر نەدات بە خاوەن کتێبخانەکان .

**پ/ئەو گۆڕانکاریانە چین کە بە نیازن لەگۆڤارەکەدا بیکەن ؟**

*/ ئەوەی ڕاستی بێت پرۆژەی زۆرمان بە دەستەوەیە بۆ پێشخستنی گۆڤارەکە لە ساڵی دووەمدا لەو پرۆژانەش: یەکەم کردنەوەی بەشێکی تایبەت بەو سیدیەی کە مانگانە لەگەڵ گۆڤارەکە دەردەچێت دووەم کردنەوەی بەشێکی فێرکاری تایبەت بە کێشەکانی ئۆتۆمبێل کە پەیوەندی بە کۆمپیوتەرەوە هەبێت سێیەم زیاد کردنی تیراژی گۆڤارەکە چوارەم کردنەوەی بەشێکی تایبەت بە پرسیار و وەڵام، هەروەها لە داهاتوودا بە نیازین بەشێکی عەرەبی بکەینەوە کە ١٦ لاپەڕە کەمتر نەبێت بۆ ئەوەی ئەو بەڕێزانەش بێ بەش نەبن کە خوێندنیان بە زمانی عەرەبیە، هەروەها لە ڕووی جوانکاری شێوەی چاپ و ناوەڕۆکیشەوە بە نیازین شێوەی چاپەکەی باشتر بکەین .

**پ/دوا پەیڤت چی یە ؟**

*/ دوا پەیڤم بۆ هەموو ستافی گۆڤارەکە و هاوکارانمان ئەوەیە کە هەردەم بە ڕۆحی بەخشندەییەوە کارەکان بکەن بۆ پێشخستنی ئاستی ڕۆشنبیری زانستی لە ناو کۆمەڵگاکەمان و و بۆ خوێنەرانی بەڕێزیش هیوادارم بە گیانی لێبوردەیی و برایانە کارەکانمان هەڵبسەنگێنن ڕەنگە ئێمە کەم و کوڕیمان هەبێت بەڵام هیچ شتێک نیە بێ کەم و کوڕی بێت تەنها خودای پەروەردگار بێ کەم و کوڕیە و پێمان خۆشە ئەگەر خوێنەر هەڵەیەک یان کەم و کوڕیەکی لە گۆڤارەکە بەدی کرد ئەوا ئاگادارمان بکاتەوە بۆ ئەوەی ئێمەش بە دەوری خۆمان چاکی بکەینەوە و لە کۆتاییشدا هیوادارم ئەم گۆڤارە ببێتە دەروازەیەکی زانستی والا بۆ هەموو زانست خوازێکی ئەم گەلە و هەموو تاکێکی ئەم کۆمەڵگایەش سوودی لێ ببینێ .

# ئاشنا بونێک لەگەڵ ستافی گۆڤاری کۆمپیوتەر

**ڕیپۆرتاژ و فۆتۆ: ڕێناز ئەردەلان بەکر**

**بەبۆنەی تێپەڕ بوونی ساڵێک بەسەر دەرچوونی گۆڤاری کۆمپیوتەر، بە پێویستمان زانی لەنزیکەوە گفتوگۆ یەک لەگەڵ ستافی گۆڤارەکە ئەنجام بدەین تالەگەڵ خوێنەر ئاشنابن . ئایا سەرنج و پێشنیارەکانیان چین؟ چ پەیامێکیان هەیە بۆ گۆڤارەکە ؟ ئەو گۆڕانکاریانە چین کەدەیانەوێ دواى ساڵێک لەدواى دەرچونی گۆڤارەکە بیکەن ؟ لەوەڵامی ئەم پرسیارانە بەم شێوەیە هاتنە ئاخاوتن.**

**سەرەتا بەڕێز ڕێبوار نوری سەعید گوتی :**



بەبۆنەی تێپەڕبوونی ساڵێک بەسەر دەرچونی گۆڤاری کۆمپیوتەر پیرۆزبایی و دەست خۆشی لەستافی گۆڤاری کۆمپیوتەر دەکەم، چونکە دەرکردنی گۆڤارێکی زانستی بەو ئاستە پێویستی بەماندوبونێکی زۆر هەیە . من وەک وردبینی زانستی و لە هەنگاوەکانی کۆتایی ئامادەکردنی گۆڤارەکە کاردەکەم، هەروەها بەشداریش لەنووسینی زنجیرە و هەندێک بابەت دەکەم . هەندێک پێشنیارم هەیە بۆ گۆڤارەکە یەکێک لەوانە ئەوەیە کە پێم باشە گۆڤارەکە بابەتی لێکۆڵینەوەی پڕۆگرام کردن و بابەتی نوێ تێدا بێت . هەروەها لەشێوازی نوسینەکانی بگۆڕین زیاتر بەرەوە زانستی ببەین . بتوانین دەرگای ئەوەش بکەینەوە ئەگەر خەڵک ڕاپۆرت و یان بابەتی زانیاری یان توێژینەوەی زانستی لەبواری کۆمپیوتەر و پڕۆگرام کردنیان هەیە بتوانین بەشێوەیەکی پوختەش بێ بۆیان بڵاوبکەینەوە و بتوانین بوارێک تەرخان بکەین بۆ چالاکی فێرکردنی منداڵان لەکۆمپیوتەر یان ئاشنا بوونیان پێی وە ئافرەتانیش هان بدەین کە زیاتر بە بابەتی زانستی و رۆشنبیری لە بواری کۆمپیوتەر بەشداری بکەن و ببن بە بەشێکی چالاک تیایدا. لە کۆتاییدا هیوادارم ئەم گۆڤارە هەر بەردەوام بێت و لە پێشکەوتندا بێت .

**بەڕێز کاوە سلێمان گوتی :**

من وەک دەستەی نوسەران لەگۆڤاری کۆمپیوتەر پیرۆزبایی لەستافی ئەم گۆڤارە دەکەم هیوای بەردەوامیان بۆ دەخوازم . سەبارەت بەکاری من لەم گۆڤارە من بابەت بەشێوەی زنجیرە بڵاودەکەمەوە بۆنمونە وەک (COOL EDIT PRO ) کەتا ئێستا بەردەوامم ئامانجیشم لەنوسینی ئەم زنجیرانە زیاتر پێشکەش


کاوە سلێمان

کردنی زانیاری زیاترە بۆ ئەوکەسانەی خولیای زانستی کۆمپیوتەرن . پێشنیارم بۆ گۆڤارەکە ئەوەیە زیاتر بابەتی نوێ سود مەند بگرێتە خۆ، ئەگەر بکرێ لەداهاتوو ژمارەی ئەم گۆڤارە زیاد بکرێت لەبەر ئەوەی لەلایەن هاولاتیانەوە داواکاری زۆری لەسەرە .

**بەڕێز عەزیز ئەسعەد گوتی :**



دەست خۆشی لەستافی گۆڤاری کۆمپیوتەر دەکەم . من وەک دیزاینەری ناوەو دەرەوەی بەرگ کە چاپکردنی گۆڤارەکە لەڕووی دیزاین و نەخشە سازیەوە ڕەنگە کەم و کوری هەبێ، بەلأم ئەوەمان لەبیر نەچێ کەهیچ کاتێک چاپخانەکان حەقی تەواوی چاپەکە نادەن. ئەو ڕەنگانەی کە ئێمە فەرزی دەکەین بەوشێوەیە دەرناچێ کەلەسەر کۆمپیوتەر بەدیار دەکەوێ ئەمەش لەبەر نەبونی ئامێری پێشکەوتوو لەشاری هەولێر، بۆیە هیوادارم زیاتر پەرە بەبواری چاپەمەنی بدرێ و ئامێری تازەی سەردەم بۆ کوردستان بهێنرێ دەمەوێ ئەوەش بەبیری خوێنەر بهێنمەوە کەنرخی گۆڤارەکە لەگەڵ (سی دی) ناگاتە چارەکی کولفەی تێچونی چاپکردنی گۆڤارەکە. بەهیوای ئەوەم

**بەڕێز فاخیر محمود میرزا دەڵێت :**



گۆڤاری کۆمپیوتەر کەیەکەم ژمارەی گەیشتە بازاڕەوە توانی کاریگەریەکی شیاو بخاتە سەر ئاشنایانی بواری کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت سودێکی زۆری پێگەیاندن لەلایەنی زانستی یەوە. من وەک بەڕێوەبەری نوسین زۆر خۆشحاڵم کە بۆ ماوەی ساڵێکە بەباشترین شێوە ئەم گۆڤارە دەگاتە دەستی خوێنەر هەر لەبەرنامەو بابەتی فێرکردن و ئەنتەرنێت یاری و مۆبایل و جۆری تر . من خۆم چەند بابەتی جیاوازم هەیە هەروەها زنجیرە بابەت دادەبەزێنم کە ئەویش (میدیا ستودیۆ) یە لەخوای مەزن داواکارم بتوانین خزمەتی گەلەکەمان بکەین جوانترین و چاکترین بابەت بگەیێنن بۆ خوێنەر.


هاوکار ڕەحمان

کـە خوێنەری کورد کەڵک لەم گۆڤارە وەربگرێ ئێمەش هەوڵ و تەقەلای خۆمان دەخەینە گەڕ بۆ پێشخستنی ئەم گۆڤارە .

**بەڕێز هاوکار ڕەحمان دەڵێت :**

مـن وەک پەیامنێـری گۆڤارەکـە خۆم بەخۆشـحاڵ دەزانم کـە بۆمـاوەی سـاڵێکە بەبەردەوامی لەم گۆڤـارە کاردەکەم . بۆخزمەتکردنی بواری کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت بۆ ئەو کەسانەی لەبواری کۆمپیوتەر شارەزان . ئەو پەیامانەی من بۆ گۆڤارەکەم دەهێنـا زیاتر لـەڕوی زانیاری و ئەنتەرنێـت هەمەڕەنگ بووە بۆیـە بەڵێنی ئەوە دەدەم لەسـاڵی دا هاتووەوە زیاتر گرنگی بە بابەتە تازەکان بدەم زووتر بیگەێنمە بەر دەستی خوێنەران.

**بەڕێـز شـاخەوان عمر حەسەن دەڵێت :**



هـەنگـاوی یـەکـەم لە هەموو کـارو هەوڵەکانی مرۆڤ بۆ هەر پرۆژەیەک یان بەرنامەیەک گرنگ و مەرجدارە کە بە گروپێنێکی زۆر مـانـدو نـەنـاسـانـە، یـان ئـەوتـا ستافێک یان کۆمەڵێک لە ڕۆشنبیران بۆ یەک ئامانجی خزمەتکردن و گەیاندنی پەیامێکی پڕ لەسود گەیاندن بە کۆمەڵگەو بە چین و توێژەکان کاربکەن. لـەم ڕوانـگەیـەوە ستافی گـۆڤاری کۆمپیوتەر خـاوەنی ئەو تایبەتمەندیانەن هـەر بۆیەش ساڵێک بەسەر تەمەنی ئەم گۆڤارەدا تێدەپەڕێت وەک یەکێک لە گۆڤارە پێشکەوتوەکان و سەرکەوتوەکان گۆڤارە بە پێزەکانی بواری زانستی کۆمپیوتەر وئەنتەرنێت دەرکەوت . من وەک یەکێک لە دەستەی نوسەرانی ئەم گۆڤارە بە سەرکەوتوویی و تەمەن درێژیی ئەم گۆڤارە دەگەرێنمەوە بۆ هەوڵ و ماندوبون و بەبێ وچان هەوڵدانی کارکردنی بەڕێزان خاوەنی ئیمتیازو سەرنوسەری گۆڤارەکە، چونکە هەر لەسەرتاوە تاکو تێپەڕینی ساڵێک بەسەر تەمەنیدا ئەم گۆڤارە بە هیچ گرفتێکی ئیداری بەبێ هیچ گرفتێکی تر توانی زۆر سەرکەوتوانە هەر دوانزە ژمارەی دەربکات لەم ماوە کەمەدا ببێت بە یەکەمین گۆڤاری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت لە کوردستان . وە هەر بە بۆنەی تێپەڕینی ساڵێک بەسەر تەمەنی ئەم گۆڤارەدا پیرۆزبایەکی گەرم لە سەرجەم ستافی ئەم گۆڤارە دەکەم بەو هیوایەی ساڵی نوێی گۆڤاری کۆمپیوتەر زیاتر هـەوڵ بدرێت بۆ نەهێشتنی هەر کەم و کوریەک کە ئەگەر بێتە پێش گۆڤارەکە و وە بتوانین بە بەرنامەی نوێ و بابەتی نوێ خزمەتی گەلەکەمان بکەین .

**بەڕێز هێرش ئیسماعیل مەولود گوتی :**



سـەرەتا بە بۆنەی تێپەر بوونـی سـاڵێک بـە سـەر دەرچوونـی یەکـەم ژمارە لەم گۆڤارە دەست خۆشی لە هەموو هاوکارانم دەکەم و هیـوای بەختـەوری و سەرکەوتنیان بۆ دەخوازم و پێـم خۆشـە هـەر بـەم بۆنەیەوە بڵێم کە بەڕاستی گۆڤارەکە بۆشاییەکی زۆری لـە بواری زانسـتیدا پڕ کردۆتەوە و خەڵکانێکـی یەکجار زۆر پەرۆشـن بـۆ بینین و کڕینی ئـەو گۆڤارە بـەڵام هەر وەکوو هەموو کەسێک منیش حەز دەکەم بڵێم ئەو ژمارەیەی کە ئێستا چاپ دەکرێ کەمە بۆ هەموو شارەکانی کوردستان چونکە ئەو ژمارەیە تەنها بەشـی قوتابیانی زانکۆ و پەیمانگاکانی شـاری هەولێر ناکات و پێویسـتە هەوڵ بدرێ بۆ زیاد کردنی تیراژی گۆڤارەکە و لە کۆتاییدا دیسـان دەسـت خۆشی لە هەموو ئەو بەڕێزانە دەکەم کە بەم گۆڤارەوە ماندوون .

**بەڕێز سەروین عبدالله گوتی :**



بەبۆنـەی تێپەڕ بوونی سـاڵێک بەسـەر دەرچونی گۆڤاری کۆمپیوتـەر پیرۆزبایی و دەسـت خۆشـی لەسـتافی گۆڤاری کۆمپیوتـەر دەکەم هیوای بەردەوامی و بەرەو پێش چوون بۆ گۆڤارەکـە دەخوازم . من وەک هەڵەچنی بابەتەکان بەر لەوەی بدرێتە بەشی نەخشەکێشان بابەتەکان هەڵەچن دەکەم ئەمەش بۆ ئەوەی وەک کار ئاسـانیەک بێت بۆبەشـی نەخشەسـازی بابەتەکان بەئاسـانی ئامادە بکرێ دووبارە دەست خۆشی لەم ستافە دەکەم .




وێنەی (١)

# چەند جێبەجێکاریەک لەبەرنامەی Snagit 7


## تابین شاخەوان


## زنجیرەی سێیەم و کۆتایی

خزمەت گوزاری سێیەم بریتیە لە دەق ئێمە ئەوەندە لەسەری ناڕۆین چونکە ئەوەندە گرنگ نیە ئەگەرچی ئەویش کۆمەڵێک کاری تایبەت دەکات ئەویش بریتیە لە کۆکردنەوەی دەقە نوسراوەکان یان هەر نوسینێک بۆ نمونە ئەگەر ویستمان ناوی هەموو ئەو فایل و فۆڵدەرو بەرنامانەی لەسەر دیسک تۆپ هەن کۆیان کەینەوەو تەنها ناوەکانیان ببینین ئەوا بەم کردارە جێبەجێ دەبێت بەهەمان هەنگاوەکانی فەرمانەکانی زنجیرەکانی تر دا دەچینەوە تەنها ئەوەندە نەبێت کە (TEXT) هەڵدەبژێرین و کلیکی لەسەر دەکەین هەنگاوەکانی تر وەک خۆی دەبێت . بەڵام بۆ دوا زنجیرە دێین باس لەکاری دابەزاندن دەکەین لە بەرنامەی SNAGIT 7 لەسەرەتادا دوای کردنەوەی بەرنامەکە دێین کلیک لەسەر (WEB) دەکەین دوایی بۆکسێک دێت کلیک لە سەر (YES) دەکەین بڕوانە وێنەی (١) لە هەنگاوی دووەم لەشوێنی (IN PUT) بەشی (PROMPT FOR ADDRESS) هەڵدەبژێرین وە لە شوێنی (OUT PUT) کیک لەسەر (FILE) دەکەین بڕوانە وێنەی (٢) . پاش ئەم دوو کردارە کلیک لەسەر (CAPTURE) دەکەین دوای کەمێک بۆکسێک دێت لەوێش زانیاریە پێویستەکان دەنوسین کە بریتەی لە ناوی ئەو ماڵپەرە بۆ نمونە ئێمە سایتی کۆمپیوتەرمان نوسیوە، بڕوانە وێنەی (٣) پاشان کلیک لەسەر (OK) دەکەین وەک لە وێنەی ژمارە (٤) دیارە بۆکسێک دێت کە نیشانمان دەدات لە چونیەتی دابەزاندنی سایتەکە .




# بەرنامەی PhotoFantasy

وێنەی (١)




وێنەی (٢)

ئا: دیلمان قاسم

بەڕێزان ئەو بەرنامەیە بۆ ئەوانە زۆربەسودە کە حەزبە گۆڕینی وێنە دەکەن هەروەها بۆدانانی وێنە لەناو جۆرەها چوارچێوەو گۆڕینی باکگراوندی وێنەکان. کارکردن لەسەر ئەم بەرنامەیە ئاسانە وە ئەو کارانەی کە ئەنجام دەدرێت چەند شتێکە کە هەموو جار دووبارە دەبێتەوە سەرەتا پاش دابەزاندنی بەرنامەکە لەسەر ئامێری کۆمپیوتەر بەرنامەکە دەکەینەوە لە سەرەوە لەلای چەپ شێوەی ئەستێرەیەک دروستکراوە لەتەنیشتی GET FANTASY نوسراوە یەکجار کلیکی لەسەر دەکەین (وێنە ١)




وێنەی (٣)

دەبینین دیسـان لەلای چەپ لەسـەرەوە SPORT بەدیـار دەکەوێـت کـە چەنـد وێنەیـەک دەمو چاوەکانیـان دیاریکراوە بەرەنگی شـین (وێنە ٢) هەروەها ئەگەر بێتو ئەم سپۆرتە بکەینەوە دەبینین چەند نوسینێکی تر دیاردەکەون کە هەر یەکەو چەند وێنەیەکـی لەخۆی گرتوە (وێنە ٣) بەڕێزان ئەگەر ئێسـتا ئێمە کلیکی لەسەر ئەم وێنانە بکەیـن ئینجا لەوبەر کلیکێک لەسـەر ئۆکەی بکەین یان سێ ئەستێرە بەدیاردەکەون کلیکێک لەسەر ئەستێرەی یەکـەم بکەیـن دەبینین ئەمجـارە چەند وێنەیەکـی جیـاواز بـە دیاردەکـەون ئەگـەر بێت و وێنەی یەکـەم هەڵبژێرین سـەیردەکەین دەموچـاوی ئـەو وێنەیە چۆتەسـەر دەموچـاوی وێنەی پێشـوو (وێنە ٤) هەروەها بە هێماکانی دەوروبەر دەتوانرێت وێنەکە بسورێنیت و هەروەها رەنگەکان بگۆریـت هەروەها لەخوارەوە PRINTER دیـارە دەتوانرێـت وێنەکـە رابکێشیت.




وێنەی (٤)

# چۆنیەتی دروست کردنی ستایل لە بەرنامەی فۆتۆشۆپ

ئا: پۆلا فەرهاد
blue_p4@yahoo.com

پەرێکی نوێ بکەوە ٤٠٠ بە ٣٠٠ وەک لە وێنە (١) دا دیارە، پاشان نوسینێک بکە، کلیکێک لە سەر چینی نوسینەکە بکە و پاشان بڕۆ بو لیستی LAYER پاشان LAYER STYLE ئینجا BLENDING OPTIOS هەڵبژێرە وەک وێنەی (٢).

پاشان پەنجەرەیەکمان بۆ دەکرێتەوە وەک (وێنەی ٣) کلیک لە سەر DROP SHADOW بکە نرخی OPACITY بکە ٪٧٥ وە نرخی DISTANCE بکە بە ٪ ٥، وە نرخی SIZE بکە ٪٥ وەک (وێنەی ٣).

پاشان کلیک لە سەر BEVEL AND EMBOSS بکە نرخی SIZE بکە بە ٪٥ وە نرخی SOFTEN بکە ٪٠ وەک (وێنەی٤).

پاشان کلیک لە سەر STORK بکە نرخی SIZE بکە بە ٪٣ وە بۆ گۆڕینی ڕەنگەکەی لەم چوار گۆشەیەی تەنیشت COLOR دەتوانین ڕەنگی لێواری نوسینەکە بگۆرین وەک (وێنەی ٥).

پاشان کلیک لە سەر NEW STYLE بکە بۆ ئەوەی ئەم ستایلەی کە دروستمان لە ناو بەرنامەی فۆتۆشۆپ خەزن بێت سەیری (وێنەی ٦) بکە.

وێنەی (١)

وێنەی (٢)




وێنەی (٣)




وێنەی (٤)




وێنەی (٥)




وێنەی (٦)

# ئاگاداری

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە توانای نووسینیان هەیە لە بواری کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت ئەگەر توانای نووسینی بابەتیان هەیە لەم بوارەدا دەتوانن بەشداری بکەن لە گۆڤاری کۆمپیوتەر و دەتوانن سەردانمان بکەن یان بابەتەکانیان بنێرن بۆ ئەم ناونیشانە : هەرێمی کوردستانی عێراق / یەکەی کۆمپیوتەر لە دیوانی وەزارەتی ڕۆشنبیری جادەی شەست مەتری نزیک هۆڵی زەرد یان پەیوەندی بکەن بە سەرنووسەرەوە بەم ناونیشانە مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئاراس هەولێر بەرامبەر قەلا باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا نهۆمی دووەم یان بە ژمارە تەلەفۆنی 2232721 مۆبایل 07504618045 یان پۆستی ئەلکترۆنی

EMAIL : COMPUTER_MAGAZINE_2005@YAHOO.COM

EMAIL : ARAS_CO_CENTER@YAHOO.COM

تێبینی :

*هەر بابەتێک بڵاو بکرێتەوە پاداشتی پێ دەدرێت .

* هەر بابەتێک لە شوێنێک یان گۆڤارێکی تری کوردی بڵاوکرابێتەوە ئێمە بڵاوی ناکەینەوە.

* بابەتەکانتان ئەگەر نەشیا بۆ بڵاوکردنەوە ئەوا ناگەڕێتەوە.

*هەر کەسێک بابەت ئەنێری بۆ بڵاو کردنەوە با بابەتەکەی لەسەر فلۆپی دیسک یان فلاش میموری بێت و وێنەی ڕوونکەرەوەکان بەجیا لە نێو فولدەرێک دا بێت و بابەتەکەی بە بەرنامەی MICROSOFT WORD بنووسێت.




وێنەی (١)

# بەرنامەیەکی گرنگ و پێشکەوتوو
# Ace optimizer utilites

**بێستون عمر**
**زنجیرەی دووەم**

بەشی دووەم لەم بەرنامەیە بریتیە لە (OPTIMIZE) کە ئەویش سێ بەشی سەرەکی لە خۆگرتوە ئێستا ئێمە دێین باسی چۆنیەتی کارکردن و سودیان دەکەین بەشی یەکەم بریتیە لە (START UP) واتە ئەم کارگوزارە بریتیە لە دانان و لابردنی بەرنامەکانی کۆمپیوتەر کە لەکاتی کردنەوەی کۆمپیوتەر خۆکاری بینەوە یان ئەگەر بینەوە چۆن لایان بەرین، چەند ڕێگایەک هەن کە لەم گۆڤارە باس کراون بەڵام ئێمە دێین لەڕێگای ئەم بەرنامەیەوە باسی ئەم کردارە دەکەین :

لە سەرەتادا کلیک لەسەر (OPTIMIZE) دەکەین کە بەشی دووەمی ئەم بەرنامەیە پاشان کلیک لە سەر ( AUTO-START MANAGER) دەکەین کە یەکەم کارگوزاری ئەم بەشەیە بڕوانە وێنەی (١) پاشان بۆکسێک دەکرێتەوە کە تەوای بەرنامەکانی ناو کۆمپیوتەر لە خۆوە دەگرێت وەک لە وێنەی (٢) ڕونکراوەتەوە بە ئارەزوی خۆت کامە بەرنامەت پێویستە دەتوانیت دەست نیشانی بکەیت بۆ ئەوەی لەگەڵ کردنەوەی کۆمپیوتەر بکرێتەوە یان کامە بەرنامە دەتەوێت لە کاتی کردنەوەی کۆمپیوتەر نەکرێتەوەو کاتت لێنەگرێت . دوای دەست نیشان کردن کلیک لەسەر (EXIT) دەکەین کە هێمای چونە دەرەوەیە بەمەش بۆکسێک دێت داوای سەیڤی ئەم گۆڕانانە دەکات بەمەش کردارەکە تەواو دەبێت .

کار گوزاری دووەم بریتیە لە



وێنەی (٢)



وێنەی (٣)

گەڕان بەدوای فایلە دوبارەکان (FIND DUPLICATE FILES) لەم بڕگەیەدا ئەم بەرنامەیە تەواوی ئەو کۆمپیوتەرە دەگەڕێت یان بەئارەزوی خۆت لە هەر کام لە قورسەکانی کۆمپیوتەر بگەڕێت بۆ ئەوەی ئەو فایلانە بدۆزێتەوە کە چەنبارە بونەتەوە چونکە ئەم فایلە دوبارانە سەر باری ئەوەی کە کۆمپیوتەر ئاڵۆزو پڕ دەکەن جگە لەمەش ئەگەر ئەم فایلە ڤیدیۆیی بێت یان رسم بێت ئەوا کۆمپیوتەر پڕ دەکەن و شوێنێکی زۆریش دەگرێت جا بۆ ئەوەی کۆمپیوتەر لەم جۆرە فایلانە پاک بکەینەوە پێویستە لەسەرەتادا کلیک لەسەر (FIND DUPLICATE FILES) بکەین وەک لەوێنەی (١) دیارە لەدوایدا بۆکسێک دەکرێتەوە وەکو لەسەرەوە باسم کرد بە ئارەزوی خۆمان قورسەکە دەست نیشان دەکەین یان ئەوەتا هەموویان بەیەکەوە دەست نیشان دەکەین وەک لە وێنەی (٣) ڕون کراوەتەوە ئینجا کلیک لەسەر (SCAN) دەکەین کە لەبەشی چەپی روکاری بەرنامەکەیە . پاشان چاوەڕێ دەکەین تا تەوای کۆمپیوتەر دەگەڕێت ئینجا تەواوی ئەو فایلانەمان دەداتێ کە لەناو کۆمپیوتەر دوبارەن بڕوانە وێنەی (٤) .

بۆ کارگوزاری سێیەم کە بریتیە لە ریموڤ کردنی بەرنامەکانی کۆمپیوتەر بێ گومان مەبەست لە ریموڤ واتە ریشەکێش کردنی تەواوی بەرنامەکە لە ناو کۆمپیوتەر ئەم کردارەش سیستەمی ویندۆز خۆشی ئەم کارگوزاریەی تێدایە بەڵام لێرەش لەم بەرنامەیە خێراترەو زۆرجار هەندێک بەرنامە ریموڤیان گران دەبێت یان ناکرێت بەڵام لە رێگای ئەم بەرنامە ئاسان ترە . کردارەکە بریتیە لە دەست نیشان کردنی بەرنامەکەو کلیک کردن لەسەر (UNINSTALL) بڕوانە وێنەی (٥). بۆیە زۆر لەسەر ئەم بەشە نادوێین چونکە بەچەند ڕێگەی تر باس کراوە ...



وێنەی (٤)



وێنەی (٥)

# بەکارهێنانی فێد لەبەرنامەی Cool Edit Pro کول ئیدت پرۆ

وێنەی (١)



وێنەی (٢)

ئا: کاوە سلێمان

بەڕێزان وەک لە هەموو زنجیرەکان باس لـە گرنگیەکانی ئـەو بەرنامە دەکەین کە توانایەکی ئەو تۆی هەیە لە بواری دەنگ ئەوا لەم زنجیرەشـدا باس لە سـودێکی تـری ئـەم بەرنامەیـە دەکەیـن ئەویش چۆنیەتـی بـەکار هێنانی فێدە، سـەرەتا فێـد چییە؟ فێـد بریتیە لە نزمـەوە زیاد بوون یاخـود بە پێچەوانەوە لە بەرزەوە نـزم بوون واتـا ئەگەر ئێمـە دەنگێکمان هەبێت لـە ناو ئامێری کۆمپیوتەرەکەمان ئەم دەنگە سەرەتاکەی لەنزمەوە دەست پێنەکات هەروەها کۆتایی یەکەشی سەبر سـەبر نزم نەبێتەوە واتا یەکسەر دەست پێبکاو لەناکاوەکیش کۆتا بێت بێ ئەوەی دەنگەکە سـەبر سـەبر نزم بێتەوە چۆن

دەتوانین فید بۆ ئەم دەنگە دابنێین لەم کاتە پەنا دەبەین بۆ بەرنامەی COOL EDIT PRO سەرەتا دێین بەرنامەکە دەکەینەوە پاشان ئەو دەنگەی پێویستمانە دێنینە ناو بەرنامەکە لەرێگای FILE وە لەوێوەش OPEN ئینجا سەرەتای ئەم دەنگە پێنج سانیەک دیاری دەکەین بە ماوس پاشان دەچینە سەر FAVORITES جارێک بە ماوس کلیکی لەسەردەکەین دەبینین چەند شتێک لە لیستەکە زیاد دەبێت لێرەدا ئێمە کارمان بەدوو شتە یەکەمیان FADE IN و FADE OUT (وێنە٢) یەکەمجار هی یەکەمیان هەڵدەبژێرین FADE IN سەیردەکەین دەنگەکە سەرەتاکەی لەنزمەوە دەست پێدەکات (وێنە ٢) پاشان دێینە کۆتای دەنگەکە بە ماوس کۆتایەکەی پێنج سانیەک دیاری دەکەین (وێنە ٣) ئەوجارەیان FADE OUT لێدەدەین سەیری کۆتایی دەنگەکە بکە بەرەو نزمی دەڕوا ئینجا کۆتایی پێدێت (وێنە ٤) پاشان دەنگەکە هەڵدەگرین لەرێگای FILE لە وێوە SAVE AS




وێنەی (٣)

وێنەی (٤)

# چۆنیەتی خستنە سەریەکی دوو وێنە یاخود دوو ڤیدیۆ لە بەرنامەی میدیا ستۆدیۆ

ئا: فاخر مەحمود




وێنەی (١)

ئازیزان وەک لە بەرگە کانی پێشوشدا باسمان لەم بەرنامە بەسودە کرد بوو کە لە بـواری مۆنتاج گرنگی یەکی ئەو توی هەیە کە توانـای پرکردنەوەی هەمو ئەو بۆشایانەی هەیە کە لە بواری مۆنتاج دێنە بەردەم مان خۆشەویستان لەم جارەشدا بـاس لـە سـودێکی تـری ئـەم بەرنامە دەکەیـن ئەویش خسـتنە سـەر یەکتری دوو وێنـە یاخـود دوو پارچـە ڤیدیۆ یە لەم بەرنامەیە ئەم کردارە زۆر پێویسـتە بـە تایبەتی بۆ ئەوانەی حـەز بە مۆنتاج کـردن دەکەن واتا ئەگەر تۆ گۆرانییەکت هەبێت بتەوێ وێنەی خۆت بخەیتە سەر ئەم گۆرانیە بەشـێویەک کە وێنەکەشـت دیار بێت و گۆرانیەکەشت دیار بێت واتا وێنەکـەت بە تەنکی دیـار بێت چۆن ئەم کارە ئەنجـام دەدەیـت ؟ سـەرەتا دێین بەرنامەکـە دەکەینـەوە پاشـان ڤیدیۆکە دێنینـە نـاو بەرنامەکـە لە رێـگا OPEN VEDIO FILE و ە ئینجـا ئـەو وێنەیـەی کـە پێویسـتمانە بیخەینە سـەر ڤیدیۆکە واتـا تەنکی بکەینـەوە لەرێزی چوارەمی بۆشـای خوارەوەی بەرنامەکە دایدەنێین هەروەها ڤیدیۆکەش لە بۆشایی سەرەوە واتا بۆشایی یەکەم دادەنێین ئینجا لەسەر وێنەکـە بەلای راسـت کلیکێـک دەکەین لیستی دەبێتەوە لە ناوەراستی ئەم لیستە OVERLAY OPTIONS هەیـە بەمـاوس کلیکێکی لەسـەردەکەین لیسـتی دووەم دەبێتە (وێنە ١) سـەیری لیستی دوو بکە لەناوەراسـت TRANSPARENSY هەیـە لە تەنیشـت ئەمەش بۆشاییەک هەیە کە ژمارەی سفری تێدایە بە زیادکردنی ئەم سـفرە وێنەکە تەنک دەبێتەوە و ڤیدیۆکە لـەدواوەی بەدیاردەکەوێـت بـۆ نمونـە ئەگـەر بێت و ئـەم ژمارەیـە بکەینە ٥٠ سـەیری (وێنە ٢) بکە ئینجا OK دەکەیت پاشان رێندەر دەکەیت بە پشتیوانی خوا لە زنجیرەکانی داهاتوو باس لە چۆنیەتی رێندەر دەکەین.




وێنەی (٢)

# زنجیرە (٦) لە بەرنامەی Adobe Premier

فەیسەڵ مەعروف

## گۆڕینی تایبەتمەندی و بینینی کاریگەریەکان

١. پاش ئەوەی کاریگەریمان ئاخنیە نێوان دیمەنەکان دەتوانین تایبەتمەندی دیمەنەکان بگۆڕین، بۆ گۆڕینی تایبەتمەندنی دیمەنەکان دەبڵ کلیک لە سەر کاریگەری Cross Dissolve دەکەین کە زیادمان کردووە لە پەنجەرەی Timeline دا . (وێنەی ١)٠

٢. دوای ئەمە Adobe تابلۆی تایبەتمەندنی کاریگەریەکان Cross Dissolve Settings نمایش دەکات، کە دەتوانی بە شێوەیەکی کردەیی (عملی) کرداری گۆڕانی نێوان دیمەنەکان ببینین بە کلیک کردنی دوگمەی Show Actual Sources. (وێنەی٢)٠

٣. ئەگەر کرداری بینین لە ڕێگای دوگمەی Space ئەنجام بدەین هەروەک پێشتر ئەنجام ماندا ئەوا پەنجەرەی نمایش Program ناوەڕۆکی بەرنامەکە نیشان دەدات، بێ دەرکەوتنی کاریگەریەکانی گواستنەوەی نێوان دیمەنەکان، بۆ بینینی کاریگەریەکان لە پەنجەرەیProgram پێویستیمان بە دروستکردنی فایلی بینین هەیە ئەم کردارەش فەرمانی بینین Preview لە لیستی Timeline هەڵدەبژێرین وە یا دوگمەی Enter لە کیبۆرد دادەگرین . (وێنەی٣)٠

٤. کرداری ئامادە کردنی فایلەکانی بینین پێویستی بە هەندێ کات هەیە وە بگوێرەی ناوەڕۆکی دیمەنەکان و ژمارەی کاریگەریەکانە، لە کاتی بنیات نانی فایلی بینین تابلۆی Building Preview دێتە سەر شاشە، وە بۆ وەستانی دەتوانین Stop کلیک بکەین . (وێنەی ٤)٠

٥. کرداری بنیات نانی فایلی بینین کردارێکی زیرەکە، بەرنامەکە هەڵدەستێ بە دروستکردنی فایلی بینینی تایبەت بەو شوێنانەی کە کردارەکانی گۆڕان و کاریگەری تێدا ڕوو دەدات، وە بۆ خێرا کردنی کرداری گەڕانەوە بۆ فایلی بینین کە دروستی دەکات و لە C:\Program Files\Adobe\Premiere 6.0\Adobe Premiere Preview Files هەڵی دەگرێت، لەگەڵ ئەوەشدا کرداری بنیات نانی فایلەکانی بینین کاتی زۆری دەوێ بەتایبەتی گەرهاتوو فایلەکان دیمەنی درێژ و کاریگەری زۆری لە خۆ گرتبێ، بۆ چارەسەری ئەمەش Adobe Premiere ڕێگەی ئەوەمان پێ دەدات کەوا کرداری بینین بۆ ئەو شوێنانە ئەنجام بدەین کە دیاریان دەکەین لە دیمەنەکان ئەوەش بۆ کورت کردنەوەی کاتە، ئەم کردارەش بە گیرکردنی ئەو شوێنانە دەبێت کە دەمانەوێ کرداری بینینی بۆ ئەنجام بدەین




وێنەی (١)




وێنەی (٢)




وێنەی (٣)




وێنەی (٤)




وێنەی (٥)



وێنەی (٦)




وێنەی (٧)

لە ڕێگای جوولاندنی نیشانەی ڕووبەر لە شریتیWork area bar ئەویش دەبڵ کلیک کردنی بۆ کەم کردنەوەی ڕووبەری سنووری شریتەکەو سنووری ئاوێنەکەیە، پاش دیار کردنی شوێنەکان دوگمەی Enter دادەگرین بۆ دروست کردنی فایلی بینین. (وێنەی ٥)·

٦.ڕێگایەکی تری خێرا بۆ بینینی دیمەنەکان کە کاریگەریەکان لە خۆ بگرێت، ئەویش بەردەوام داگرتنی دوگمەی Alt لە کیبۆرد لەگەڵ جوولاندنی کێرسەری ماوس لە سەر ڕاستە هێڵی کات و کلیک کردنی پاشان ڕاکێشانی بە لای چەپ و ڕاست بۆ ئەوەی لە پەنجەرەی نمایشی Program ئەو شوێنە نیشان بدات کە هێڵی دەستکاری لە سەرە .(وێنەی ٦)·

٧. کرداری بینین بۆ دیمەنەکان ئەنجام دەدەین و سەیر دەکەین لە کاتی خوێندنەوەی دیمەنی سێیەم Fastslow.avi، دوا ساتەکانی دیمەنی سێیەم بە شێوەیەکی هێواش دەڕوات و بەلام فایلە دەنگیەکە ئیقاعی دەگۆڕێت و دەبینین کە ناڕێکیەک بە دی دەکرێت لە نێوان دەنگەکە و دیمەنەکە، بۆ ئەوەی جۆرە هاوسەنگیەیەک لە نێوان فایلە دەنگیەکە و دیمەنەکە دروست بکەین هەڵدەستین بە هێواش کردنی خێرایی دیمەنی سوار پایسکلەکە و کەمێ درێژی دەکەین بۆ ئەوەی لەو کاتەی ئیقاعی شەپۆلی دەنگیەکە سەر لە نوێ بەرز دەبێتەوە وکۆتایی پێ بێت.

## بڕینی دیمەنەکان

کرداری هێواش کردنی خێرایی دیمەنەکان کارێکی ئاسانە لە Adobe Premiere بەلام لە بەر ئەوەی ئێمە دەمانەوێ بەشێ لە دیمەنەکە هێواش بکەین، باشتر وایە کەوا ئەو بەشەی دەمانەوێ هێواشی بکەین، ببڕین لێرە دا واتە دابەش کردنی دیمەنەکە بۆ دوو بەشی جیا بەم شێوەیە دەتوانین ئەو بەشەی دەمانەوێ کاری لە سەر بکەین هێواشی بکەین بێ ئەوەی کار بکاتە سەر تەواوی دیمەنەکان. بۆ بڕینی دیمەنەکان ئەم هەنگاوانە دەگرینە بەر:

١. ئەو بەشەی دەمانەوێ کاری لە سەر بکەین ئەو بەشەیە پایسکل سوارەکە دەردەکەوێت، لە پەنجەرەی Mointer و لە بەشی نمایش Program ئاراستەکانی Frame Forward بۆ پێشەوە بردنی پارچە پارچە وFrame Back گێڕانەوە




وێنەی (٨)

بۆ دواوەی پارچەپارچە،لە دوای پارچەی یەکەم دەگەڕێین نیشانەی هێڵی دەستکاری دەجوڵێنین بۆ سەرەتای پارچەکە لە چرکەی (١١,٢١). (وێنەی٧)٠

٢. ئێستا کە هەڵدەستین بە بڕینی دیمەنەکە لەو خاڵە بۆ ئەوەی ئەم ببێتە بەشێکی جیاکراوە لە دیمەنەکە، ئامرازی Razor لە تابلۆی ئامرازەکان Timeline بە کار دەهێنین وە دوگمەی C لە کیبۆرد دادەگرین .،(وێنەی٨)٠

٣. لە پەنجەرەی Timeline کرداری بڕین و جیاکردنەوە ئەنجام دەدەین، ئامرازەکە دەجوڵێنین تا دەگاتە هێڵی دەستکاری،ئینجا دەست دەکەین بە بڕین . (وێنەی ٩)٠

٤. ئێستا دیمەنی Fastslow.avi لە دوو بەش پێک هاتووە دەتوانین کار لە سەر هەر یەکێکیان بکەین وهەمواری بکەین بێ ئەوەی کار بکاتە سەر ئەوەی تریان.




وێنەی (٩)

## ئاگاداری

داوا لـە هەمـوو ئـەو خوێنـەرە بەڕێزانە دەکەین کە هەر پێشـنیارێک یـان هەر تێبینێـک یان هەر ڕەخنەیێکیـان هەبـوو یان هەر کـەم و کورێکیان لە گۆڤارەکە بە دی کرد بـا ئاگادارمان بکاتەوە بەم ناونیشانە : هەرێمی کوردستانی عێراق / یەکەی کۆمپیوتەر لە دیوانی وەزارەتی ڕۆشنبیری لە هەولێر جادەی شەسـت مەتـری نزیک هۆڵی زەرد ژمـارە تەلەفۆنی ٢٢٣٢٧٢١ مۆبایـل ٠٧٥٠٤٦١٨٠٤٥ یان پۆستی ئەلکترۆنی.

EMAIL : COMPUTER_MAGAZINE_2005@YAHOO.COM

EMAIL : ARAS_CO_CENTER@YAHOO.COM

EMAIL : ARAS_AAA@HOTMAIL.COM

# بەرنامەی VidShot Capturer بۆ وێنەگرتنی شاشە

ئا: هیوا عبدالنافع

بەرێزان ئـەم بەرنامەیـە زۆر گرنگە بـۆ ئەو کەسـانەی کـە کاری فێرکردنی بەرنامەکانی کۆمپیوتـەر ئەنجام دەدەن، بەهـۆی ئەم بەرنامەیەوە دەتوانن وێنەی شاشـەی ویندۆس بگرین لە کاتی شەرح کردنی بەرنامەیەک یان ڕوون کردنەوەی هەر بابەتێک. ئەم بەرنامەیە بەرنامەیەکی بچوکـە دەتوانن لەم لینکـەوە داونلۆدی بکەن:

HTTP://WWW.GEOVID.COM/DOWNLOAD/VIDSHOT-CAPTURER.EXE

ئـەم بەرنامەیە لە چەند بەشـێک پێک هاتـووە وەک لـەم وێنەیـەی خـوارەوە ڕوونم کردۆتەوە:

١. بـۆ هەڵبژاردنـی شـوێنی خـەزن کردنـی فایلە ڤیدیۆییەکـەی کە دەتەوێت وێنەی بگری.

٢. بـە دیاری کردنی ئـەم هەڵبژاردەیە دەتوانیت بەشێک لە شاشە دیاری بکەی کـە دەتەوێـت وێنـەی بگری، بـۆ نمونە ئەگەر تۆ بتەوێـت بەرنامەی وۆرد باس بکـەی بەڵام حـەز دەکەی تەنهـا وێنەی پـەرە سـپی یەکـە بگرێت یـان وێنەی هەمـووی بگرێـت جگـە لەدیسـک بار بەهۆی ئەم هەڵبژاردەیەوە دەتوانیت ئەم کارە بکـەی، پاش کلیک کردن لەسـەری دراگی دەکەیت و بەشەکە دیاری دەکەیت کە دەتەوێت.

٣. ئـەم هەڵبژاردەیـەش گرنگـە کـە بەهۆیـەوە دەتوانـی ئـەو بەشـە دیاری بکـەی کە دەتەوێت لە کرداری وێنەگرتن دەربچێـت، بەمـاوس بەهـۆی کـرداری ڕاکێشـان واتە دڕاگ و دڕۆپ بەشـەکە دیاری دەکەیت.




وێنەی (١)

٤. ئـەم فەرمانە بریتیـە لە وێنەگرتنی تەواوی شاشەی ویندۆس.

٥. ئەم فەرمانەش دیارە، واتە دەسـپێ کـردن بە کـرداری وێنەگرتن،پاش کلیک کردن بەرنامەکە لەسەر شاشە بزر دەبێت کرداری وێنەگرتن دەست پێ دەکات، بۆ ڕاگرتنی کرداری وێنەگرتن پەنجە بنێ بە کلیلی F9 لەسەر کیبۆرد ئینجا بەرنامەکە بـەم شـێوەیە وەک لەوێنەکـە دا ڕوونم کردۆتەوە هەڵدەسـتێ بە سەیڤ کردنی ڤیدیۆیەکـە، ئەمـەش کاتێـک دەخایەنێت (بەپێی درێژی کاتی وێنە گرتنەکە). وەک لە وێنەکەدا ڕوونە:

پاش تەواو بوون بۆ کسێک دێت دەڵێ ئایا دەتەوێت پارچە ڤیدیۆیەکە ببینیت کە تەصویرت کردوە؟




وێنەی (٢)




وێنەی (٣)

# بەرنامەی (Photo Effect)

ئا: محمود محمد حسن ساڵەیی
mehmud_felek@yahoo.com

ئەم بەرنامەیە لەبواری وێنەدا خزمەتێکی زۆرت پێشکەش ئەکات لەگەڵ ئەوەی کە (ئاڵۆز) نییە وەکو هەندێ بەرنامەی وەک (PHOTOSHOP) و چەندینی تر لەگەڵ ئەوەی کە کاری زۆر لەو بەرنامانە ئەکات.

لەخوارەوە بەکورتی باسی دەکەین: سەرەتا وەکو هەر بەرنامەیەک (OPEN)ی وێنەیەک ئەکەین و دەچینە ناوبەرنامەکە، وەکو وێنە (١):

پاشان لەسەر هەر وێنەیەک کلیک بکەی کۆمەڵە وێنەیەکت ئەداتێ تۆش بەویستی خۆت دانەیەک هەڵ ئەبژێری.

وە ئەگەر ویستت گۆڕانکاری زیاتر بخەیتە سەر وێنەکە ئەوا کلیک لەسەر (ARTISTIC, PHOTOGRAPHY, ACCENTS, DARKROOM, FRAMES) بکە کە هەر بەشەو چەندین فیلتەری زۆر جوانت پێ ئەبەخشێ.

ئەم وێنانەی کە لە وێنە ژمارە (٢)دا دیارە بەم بەرنامەیە دروست کراوە:

وە ئەگەر بمانەوێ بەشە نووسینێک زیاد بکەین ئەوا دەچینە سەر بەشی (A) واتە تێکست بەخزمەتگوزاریەکی باشەوە کاری نووسینیشت بۆ ئەنجام ئەدات.




وێنەی (١)




وێنەی (٢)



# زنجیرەی (٤) لەبەرنامەی Auto CAD

ئامادەکردنی: غزالە یونس



وێنەی (١)

**پێشەکی:-**

بەرێزان لە بەشی ئەمڕۆدا باس لە چەند ئایکۆنی تر دەکەم کە تەواو کەرن بۆ بەشەکانی ڕابردوو بە هیوای سوود وەرگرتنتان:

**١- لاکێشە (چوارلا).**

ئەم فرمانەش دەتوانین بۆ گەلێک شێوە لە کاتی وێنە کردندا بە کاری بهێنین سوودی زۆریشی هە یە . جالێرە دا بانگ کردنی فرمانە کە لە چە ند شوێن و بە چە ند ڕێگا دە بێ. وەک (وێنە ی١) (DRAW) – لە لیستی وێنەکردن (١) وە نوسینی ناوی ئایکۆنەکە. (وێنەی ٢).

٢-لە شریتی زانیاریەکان COMMAND

٣- لەشریتی کە رستەکان بەکلیک کردن لەسەر ئایکۆنە کە (وێنەی٣).

پاش ئەوەی کە بانگی فرمانەکەمان کرد خاڵی سەرەتاو خاڵی کۆتایی دەست نیشان دەکەین کەوەک لە ڕێگاکانی ڕاستە هێڵ زانیمان لێرەدا بەهەمان شێوە خاڵەکانی سەرەتا و کۆتایی بە یاریدە ی شریتی زانیاریەکان دەست نیشان دەکەین . یاخود دەتوانین بەڕێگاکانی تری ڕاستە هێڵ یان چوار گۆشە دروست بکەین.

بۆ نموونە ئەگەر شێوەیەکمان هەبێ درێژیەکەی ٢٥٠ و پانی ٣٠٠ بێت ئەوا دەتوانین وێنەکەی بکێشین بەم شێوەییەی خوارەوە :-

**ڕێگای یەکەم:-**

چ بۆ ئەوەی ڕاستەهێڵەکەمان خوار نەبێت.

١- F8 (ORTHO)

٢-ئینجا ڕاستەهێڵ بانگ دەکەین بۆنموونە خاڵی سەرەتایی پێدەدەین ١٠و ١٠ .

٣-ئینجا دەستمان بۆ لای ڕاست دەبەین (ماوس) ٢٥٠ دە نووسین و ENTER.

٤-پاشان دەستمان بۆ سەرەوە (ماوس) ٣٠٠ دەنووسین و ENTER.

٥- پاشان ماوس بۆ دەستە چەپ دەبەین ٢٥٠ دە نووسین ENTER.

٦- پاشان ماوس بۆ خورەوە دەبەین ٣٠٠ دەنوسین ENTER.



وێنەی (٢)




وێنەی (٣)

٧- پاشان ENTER دەکەین بۆ پچڕاندن لە ڕاستە هێڵەکە . وە ک (وێنەی ٤).

COMMAND: _LINE SPECIFY FIRST
: <POINT<10.10
SPECIFY NEXT POINT OR [UNDO]:
250
SPECIFY NEXT POINT OR [UNDO]:
300
SPECIFY NEXT POINT OR [CLOSE/
UNDO]: 250
SPECIFY NEXT POINT OR [CLOSE/
UNDO]: 300
SPECIFY NEXT POINT OR [CLOSE/
:[UNDO

### ڕێگای دووەم:-

بانگی RECTANGL دەکەین .دوای ئەوەی داوای خاڵی یەکەم دەکات .لێرە دا ئێمەش خاڵی سەرە تا بۆ نموونە ١٠و١٠ دەنووسین لە شریتی زانیاریەکان. ئینجا داوای خاڵی دووەم دەکات .ئێمەش لە کاتی نووسینی خاڵی دووەم دەبێت خاڵەکە بەرێگای پۆتانی ڕێژەیی دەنووسین. کە دەبێتە ٢٥٠،٣٠٠ پاشان ENTER.

جا لێرەدا دەتوانین بە ڕێگای تریش دروستی بکەین. لێرەدا دەتوانین شێوەیەکی وا دروست بکەین گۆشەی هەر چوار لای بازنە بێت و بەنیوە تیرەیەکی دیاری کراو دیاری بکەین بۆ نموونە بانگی فرمانە کەدەکەین لە ناو داواکاریەکانی فرمانی FILLET دە ست نیشان دەکەین .پاشان هەڵدەستین بە دەست نیشان کردنی RADIUS ئینجا ENTER پاشان بۆ نموونە نیوە تیرەکەی ٥ دەدەینێ ئینجا ENTER دەکەین. جالێرەدا ئەگەر لاکێشەیەکمان دروست کرد ئەوا گۆشەکانی شێوەی بازنەیی دەبێت .وە ک وێنەی ٥ . یان ئەگەر بمەوێت لاکێشەکەم پانیەکی هەبێت لێرەدا لە ناو داواکاریەکان WIDTH دە ست نیشان دەکەین پاشان بری ئەستووریەکەی دەدەینێ بۆ نموونە ئەگەر بمانەوێت ئەستووریەکەی ٥ بێت پاشانENTER دەکەین جا ئەگەر هاتوو ئێستا لاکێشە کەمان درووست کرد بەم شێوەیەی خوارەوە دەبێت (وێنەی ٦).

### ٢ - چەند لا (POLYGON):-

لە فرمانی چەند لا دا دەتوانین شێوەی وا دروست بکەین بە پێی جۆری کارەکەمان بە مەرجێ چەندلا کەمان نابێ ژمارەی لاکانی لە ٣ کەمتر بێت و وە ١٠٢٤ زیاتر بێت لێرەدا لە کاتی وێنە کردندا تۆ لە وێنەی چەند لایەک دەکێشیی لە دەوری




وێنەی (٤)




وێنەی (٥)




وێنەی (٦)

بازنەیەکی خەیالی دا چونکە لە کاتی وێنە کردندا داوا دەکات چەند لا کەت لە ناوەوەی بازنە یان لە دەرەوەی وێنەی بکەم وەک لەم هەنگاوەی خوارەوە دا دیارە:-

**١-لە ناوەوەی بازنەدا بێت:-**

بۆنموونە ئەگەر ژمارەی لاکانی ٥ بێت وە چەقی وێنەکەت دەتوانیت بە ئارەزووی خۆت بێت ئەگەر بلێین ٣٠،٣٠ وە لە ناوەوەی بازنە بێت ئینجا داوای نیوەتیرەکەی دەکات بۆ نموونە ئەگەر نیوەتیرەکەی ٢٠ بێت . جا لێرەدا بانگی POLYGON دەکەین وەک هەموو فرمانەکانی تریان لە شریتی لیستەکان یان شریتی زانیاریەکان یان لەشریتی کەرستەکان

COMMAND: _POLYGON ENTER
NUMBER OF SIDES <4>: 5
SPECIFY CENTER OF POLYGON
{ <OR [EDGE<30.30
ENTER OPTION [INSCRIBED IN
CIRCLE/CIRCUMSCRIBED ABOUT
CIRCLE]<I>: I
SPECIFY RADIUS OF CIRCLE:
20

**ب- لە دەرەوەی بازنە:-**

بە هەمان شێوەی سەرەوە بانگی فرمانە کە دەکەین هەموو برەکانی وەک خۆی دەنووسین تەنها لە کاتی پرسیار کردن لە هەنگاوی سێیەم ئایە لە ناوەوەی بازنە بێت یان لە دەرەوەی ئێمە ئەم جارە پیتی C دەنووسین واتە لە دەرەوەی بازنە بێت . وەک ئەم هەنگاوانانە ی خوارەوە:

COMMAND: _POLYGON ENTER
NUMBER OF SIDES <4>: 5
SPECIFY CENTER OF POLYGON
{ <OR [EDGE<30.30
ENTER OPTION [INSCRIBED IN
CIRCLE/CIRCUMSCRIBED ABOUT
{CIRCLE]<I>: C
SPECIFY RADIUS OF CIRCLE:
20

جا لێرەدا دەتوانم هەردوو وێنەکە ببینم بۆ جیاکردنەوەتان یەکەمیان بە ڕەنگی سوور ئەوی تر بە ڕەنگی زەرد. بەڵام بازنە خەیالیە کە ئەگەر هاتین درووستمان کرد بە ڕەنگی شین وە بەهەمان بڕی چەند لاکە ئەوا شێوەکەی (لەوێنەی ٧) دیارە .




وێنەی (٧)

# زنجیرەی (٦) لە بەرنامەی فلاش MX

# رەنگەکان لە فلاشدا

فەیسەڵ مەعروف




وێنەی (١)

**هێنان ونمایش کردنی فایلە ڤیدیۆییەکان لە فلاش MX**

نمایش کردنی فایلی ڤیدیۆیی لە فلاش تازەیە و لە ڤیرشنی ٢٠٠٤ بە شێوەیەکی پێشکەوتوو جێبەجێ دەکرێت لە لایەن بەرنامەی فلاش، ئەو فایلە ڤیدیۆیانە بەرنامەی فلاش رەفتاریان لەگەڵ دەکات وەریان دەگرێت بریتین لەم جۆرانەی خوارەوە:

-1 AVI
-2 ASF.WMV
-3 MPG
-4 DVI.DV

پاش هێنانی فایلی ڤیدیۆیی شاشەیەکمان بۆ دەکرێتەوە ئەو چوار گۆشەیەی کە دەکەوێتە بەشی سەرەوەی لای چەپە بریتی یە لە فلیمەکە و بە بەکار هێنانی سکرۆڵەکەی خوارەوە دەتوانین فلیمەکە ببینین، هەردوو تایبەتمەندی QUALITY و چوار چێوەی کلیل KEY INTERVAL لە شاشەکە هەن، گرنگترین فەرمان بریتییە لە فەرمانی ژمارەی چوار چێوەکانی ڤیدیۆیی بەرامبەر بە ژمارەکانی چوار چێوەکان لە فلاشدا NUMBER OF VIDEO FRAMES TO ENAODE PER NUMBER OF MACROMEDIA FLASH FRAMES، گەر ژمارەی چوار چێوەکان وەک یەکمان هەڵبژارد (١:١) ئەوا خێرایەکەی ئاسایی دەبێت کە بریتی یە لە (١٢) چوار چێوە لە چرکەیەکدا، سەیر دەکەین لە لای خوارەوە قەبارەو و درێژی فلیمەکە و (FRAME/SEC) بە چاو دەکەوێت، ئەگەر رێژەی (١:٢) مان هەڵبژارد واتا خێرایی نمایش کردنی فلیم (٦) چوار چێوە دەبێت لە چرکەیەکدا بەمەش هێواش دەبێت، هەروەها دەتوانین فلیمەکە بە دەنگەوە بهێنین بە کارا کردنی IMPORTAUDIO.(وێنەی ١)·

ئەگەر درێژی فلیمەکە لە ژمارەی چوار چێوەکانی فلاش زیاتر بوون، ئەوا فلاش ئەم نامەیەمان نیشان دەدات و YES هەڵدەبژێرین بۆ ئەوەی فلاش چوار چێوەی زیاتر دابین دەکات بۆ نیشاندانی فلیمەکە بە تەواوی.(وێنەی٢)·

دەتوانین فلیمەکە بگۆرین بۆ MOVIE CLIP ئەویش بە سێبەر خستنە سەر چوار چێوەی یەکەم لە فلیمەکە و دوگمەی F٨ دادەگرین، پاشان دەتوانین دەستکاری بکەین بە ئارەزووی خۆمان وەک جولاندن و کاڵ و تۆخ کردن ئەویش لە رێگای تایبەتمەندی ALPHA جێ بەجێی دەکەین.

Macromedia Flash



This video requires 16465 frames to display its entire length. The selected timeline span is not long enough. Do you want the required number of frames automatically inserted into the timeline span?

Don't show me this message again.

Yes | No

وێنەی (٢)

# راپۆرتەکان (Reports)

زنجیرە (٢) ڕێبوار نوری

دروستکردنی راپۆرت بەرێگای REPORT WIZARD و بەبەکارهێنانی زیاتر لەیەک سەرچاوەی داتا (خشتە یان کویری).

ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بگرە بەر بۆ دروستکردنی راپۆرت بەم رێگایە:

١- لە لیستی تەنەکان OBJECTS لە چوارچێوەی داتابێس یەک کلیک لەسەر REPORTS بکە (وێنە١).




وێنەی (١)

٢- لە لیستی ئامرازەکانی چوارچێوەی داتابێسەکە یەک کلیک لەسەر دوگمەی NEW بکە، دوای ئەو خانەیەی خوارەوە دێتە سەر شاشە چەند رێگایەک پیشان دەدات بۆ دروستکردنی راپۆرت (وێنە٢).

٣- لە خانەی سەرەوەی لای راست یەک کلیک لەسەر رێگای REPORT WIZARD بکە.

٤- لە ژێرەوەشی لیستی ناوی خشتەکان بکەوەو یەک کلیک لەسەر ناوی ئەو خشتەی ئەتەوێت (لێرەدا خشتەی tbl Authors) بکە بۆ هەڵبژاردنی (وێنە٣).

٥- یەک کلیک لەسەر دوگمەی OK بکە، دوای ئەوە خانەیەکی تر دێتە سەر شاشە تیایدا ئەو کێڵگانە بۆ راپۆرتەکەت هەڵئەبژێریت کە ئەتەوێت داتاکەی لەکاتی چاپکردن دەربچێت:(وێنە٤)

* لە ژێر خانەی AVAILABLE FIELDS یەک کلیک لەسەر ناوی ئەو کێڵگەیەی کە ئەتەوێت لە راپۆرتەکەدا دەربچێت بکە بۆ دەستنیشانکردنی (لێرەدا کێڵگەی AUTHOR ID).

* یەک کلیک لەسەر دوگمەی < بکە بۆ هەڵبژاردنی کێڵگەکە، دوای ئەوە ناوی کێڵگەکە ئەچێتە ژێر خانەی کێڵگە هەڵبژاردراوەکان SELECTED FIELDS.

* بۆ رەتکردنەوەی هەرکێڵگەیەک لەژێر خانەی SELECTED FIELDS یەک کلیک لەسەر ناوی کێڵگەکە بکەو ئینجا یەک کلیک لەسەر دوگمەی > بکە.

* بۆ هەڵبژاردنی ناوی هەموو کێڵگەکان یەک کلیک لەسەر دوگمەی << بکە.

* بۆ رەتکردنەوەی هەڵبژاردنی هەموو کێڵگەکان یەک کلیک لەسەر دوگمەی>> بکە (وێنە٥).

٦-دوای تەواوبوون لە دەستنیشانکردنی ناوی کێڵگەکان یەک کلیک لەسەر دوگمەی NEXT بکە (وێنە٦).

٧- خانەیەکی تر دێت بەناوی DO




وێنەی (٢)




وێنەی (٣)

وێنەی (٤)

YOU WANT TO ADD ANY GROUPING LEVELS?، تیایدا دەست نیشانی ناوی کێلگەیەک دەکەیت بۆ گروپ کردنی زانیاریەکان لە کاتی پیشاندانی لەسەر راپۆرتەکە. بۆ ئەم مەبەستەش یەک کلیک لەسەر ناوی کێلگەکە بکە ئینجا یەک کلیک لەسەر دوگمەی بکە بۆ هەڵبژاردنی کێلگەکە بۆ گروپ کردن، لەم نموونەیەدا هیچ ئاستێک بۆ گروپ کردن بەکارناهێنین بۆیە دەستکاری هیچ ناکەین.

٨- تەنها یەک کلیک لەسەر دوگمەی NEXT بکە.

٩-دوای ئەوە خانەیەکی تر دێت بەناوی WHAT SORT ORDER DO YOU WANT FOR DETAIL RECORDS? بۆ هەڵبژاردنی جۆری ریزبەندی تۆمارەکان، بۆ ئەم مەبەستەش لیستی ١ بکەوەو ناوی ئەو کێلگەیە هەڵبژێرە کە ئەتەوێت تۆمارەکان لەسەری ریزبکرێن و ئینجا بۆ دەستنیشان کردنی جۆری ریزبەندی بەشێوەی ASCENDING یان DESCENDING یەک کلیک لەسەر دوگمەی تەنیشت ئەو لیستەبکە. (تێبینی: پرۆگرامی ئەکسێس بە شێوەی دیفۆڵت جۆری ASCENDING ی هەڵدەبژێرێت بۆیە وەک خۆی لێی گەرێ ئەگەر ئەتەوێت ریزبەندیەکە بەرەوسەرەوە بێت) (وێنە٧).

١٠- دوای ئەوە یەک کلیک لەسەر دوگمەی NEXT بکە.

١١- دوای ئەوە خانەیەک دێت بەناوی HOW WOULD YOU LIKE TO LAY OUT YOUR REPORT? بۆ دەستنیشان کردنی ئاراستەی لاپەرەو فۆرماتی (شێوازی) پیشاندانی زانیاریەکان لەسەر راپۆرتەکە، (وێنەی ٨).

لە خانەی ORIENTATION : ئەتوانیت دەستیشانی ئاراستەی لاپەرە بکەیت (ئایا ئەتەوێ بەدرێژی لەسەر لاپەرە کە چاپ بکەیت PORTRAIT یان بەباری پانی لەسەر لاپەرەکە چاپ بکەیت LANDSCAPE ) بۆ هەڵبژاردنی هەر کامێکیان یەک کلیک لەسەر ووشەکە بکە. لێرەدا ئەمانەوێت PORTRAIT بێت کە پرۆگرامی ئەکسێس وەک دیفۆڵت هەڵی بژاردوە.

لە خانەی LAYOUT: ئەتوانیت دەستنیشانی شێوازی پیشاندانی زانیاریەکانی سەر راپۆرتەکەت بکەیت، بۆ هەڵبژاردنی هەر یەکێکیان یەک کلیک لەسەر ناوی شێوازەکە بکە، لەم نموونەیەدا ئەمانەوێت خشتەیی بێت، واتا یەک کلیک لەسەر TABULAR بکە بۆ هەڵبژاردنی.

١٢- دوای ئەوە یەک کلیک لەسەر دوگمەی NEXT بکە.

١٣- دوای ئەوە خانەیەک دێت بەناوی WHAT STYLE WOULD YOU LIKE? بۆ دەستنیشان کردنی ستایلێک کە جۆرێکە لە (شێوازی یان فۆرماتی) ناونیشانی راپۆرتەکەو ناوی ستوونەکانی سەر راپۆرتەکە، بۆ هەڵبژاردنی هەر ستایلێک لە خانەی لای راست یەک کلیک لەسەر ناوی ستایلەکە بکە، لێرەدا CORPORATE هەڵبژێرە بۆ ئەم مەبەستەش یەک کلیک لەسەر CORPORATE بکە (وێنە٩).

١٤- دوای ئەوە یەک کلیک لەسەر دوگمەی NEXT بکە.

وێنەی (٥)

١٥- دوای ئـەوە خانەیەکی تر دێت بە نـاوی WHAT TITLE WOULD YOU LIKE FOR YOUR REPORT?، بـۆ نووسـینی ناو و ناونیشانی راپۆرتەکەت، پرۆگرامی ئەکسـێس خۆی ناوێک پیشان دەدات کە لەسـەرچاوەی داتاکەوە وەری دەگرێت، بـۆ گۆرینی یـەک کلیک لەسـەر ناوەکە بکەو دەسـت بکە بە نووسینی ئەوناوەی کـە خـۆت ئەتەوێـت، لـەم نموونەیـەدا راپۆرتەکـەت ناوبنـێ RPT AUTHORS (وێنە١٠).

١٢- دوای یەک کلیک لەسەر دوگمەی FINISH بکە، پرۆگرامی ئەکسێس دەست دەکات بـە دروسـتکردنی راپۆرتەکـەو دەیکاتەوەو دەیهێنێتە سەر شاشە.

Report Wizard

Do you want to add any grouping levels?

AuthorID, AuthorFirstName, AuthorLastName, BirthDate, BirthPlace, City, Country, Email, Phone, Notice

Grouping Options ... | Cancel | < Back | Next > | Finish

وێنەی (٦)

Report Wizard

How would you like to lay out your report?

Layout: Columnar / Tabular / Justified — Orientation: Portrait / Landscape

Adjust the field width so all fields fit on a page.

Cancel | < Back | Next > | Finish

وێنەی (٨)

Report Wizard

What sort order do you want for your records?

You can sort records by up to four fields, in either ascending or descending order.

1 AuthorID Ascending
2 Ascending
3 Ascending
4 Ascending

Cancel | < Back | Next > | Finish

وێنەی (٧)

Report Wizard

What title do you want for your report?

rptAuthors

That's all the information the wizard needs to create your report.

Do you want to preview the report or modify the report's design?

Preview the report.

Modify the report's design.

Display Help on working with the report?

Cancel | < Back | Next > | Finish

وێنەی (١٠)

Report Wizard

What style would you like?

Bold, Casual, Compact, Corporate, Formal, Soft Gray

Title

Label above Detail

Control from Detail

Cancel | < Back | Next > | Finish

وێنەی (٩)

# بەرنامەی (Fanta Morph)

ئامادەکردنی: دەوەن مسعود ساڵەیی
dawwan1985@hotmail.com




وێنەی (١)

بۆ تێکەڵ کردنی دوو وێنە بەکاردێت و دەتوانین جوانکاری لە نێوانیان دابنێی و شێوەی راستەقینەی وێنەکە بگۆڕێت وئەم کارانەی پێ دەکرێ وەکو چاوتروکان زەردەخەنە و جوڵەی لوت و گوێ و هتد...

**چۆنیەتی کار کردنی:**

سەرەتا دەچینە بەشی/ IMAGE(1) IMPORT\ FILE بۆ دیتنی وێنەی یەکەم دواتر دەچینە بەشی IMAGE(2)\ IMPORT\ FILE بۆ دیتنی وێنەی دووەم وەکو لە وێنە ژمارە (١) دیارە.

دواتر بەکلیک کردن لەسەر وێنەکانی بەشی سەرەوە خاڵمان بۆ زیاد دەبێت چەن کلیک زیاد بکەین ئەوەندە خاڵمان بۆ زیاد دەبێت و دەتوانین لە رێگەی خاڵەکانەوە جوڵە و گۆڕان کاری لەسەر وێنەکان بکەین وەکو لە وێنە ژمارە (٢) دیارە, وە لە تەنیشتەوە لە بەشی (MASK)دەتوانین باگراوندی وێنەکە بگۆڕین .

بۆ دەسکاری کردنی تایبەت مەندیەکانی بەرنامەکە دەتوانیت لە بەشی (TOOLS\ OPTIONS)سوود وەربگریت. وەکو لە وێنە ژمارە (٣) دیارە:

لە کۆتاییدا دەتوانیت (SAVE) بکەین بەم (TYPE) انەی خوارەوە وەکو:

AVI MOVIE & GIF & FLASH & MOVIE
SAVER SCREEN & WEB PAGE& IMAGE

بۆ ئەم مەبەستە دەچیتە بەشی (EXPORT MOVIE)

THE END◦ THE)
(END◦THEEND◦THE END



# گەڕاندنەوەی زانیارییەکان لەسەر سیدی تێکچوو بەهۆی بەرنامەی CD Data Rescue V1.1

**Unregistered Copy**





CD Data Rescue EP. © 2001 Naltech Software.
Version.1.1 Build 1609. All Rights Reserved.

**THANK YOU FOR TRYING CD DATA RESCUE!**

This is an unregistered copy for evaluation use which can be used for a period of 30 days.

Please remember that any other use requires payment of the registration fee.

Read License Agreement for details.

License

→ Enter Registration

Ordering Info

**Register CD Data Rescue in only three minutes !**

Order now CD Data Rescue



Exit

ئێرە کلیك بکە بۆ کارکردنی بەرنامەکە → Continue Unregistered

kameran7605@yahoo.com

وێنەی (١)

ئا: شیلان خسرەو خالد - شەقڵاوە

دەتوانین لەڕێی ئەم بەرنامەیەوە زانیاری وداتاکان بگەڕێنینەوە کەهەن لەسەر سیدی زیانپێکەوتوو، کە سیستەمی ویندۆز ناتوانی بیناسێتەوە یاخود بیکاتەوە، لەهەر جارێکدا کە سیستەمی ویندۆز نامەیەکی هەڵەت پیشان دەدات لە کردنەوەی سیدیەکە ئەوا ئەم بەرنامەیە هاوکاریت دەکات بۆ گەڕاندنەوەی داتاکان، وە هەروەها ئەم بەرنامەیە لەتوانایدایە کەوا ئەو مەلەفانەی ڕەش کراونەتەوە لەسەر سیدی جۆرەکانی CD-R یان CD-WR بگەڕێنێتەوە، بەمەرجێک دووبارە زانیاری لەسەر تۆمارنەکرابێت .

**باس کردنی بەرنامەکە**

پاش دابەزاندنی بەرنامەی CD DATA

RESCUE لەسەر ئامێرەکەت، هەڵسە بەکردنەوەی بەرنامەکە دەبینین ئەم شاشەیەت بۆ بەدیاردەکەوێت (وێنەی ژمارە ١)، کلیکی دوگمەی CONTINUE بکە وەکو لەوێنەکەدا UNREGISTERED دیارە، بۆ ئەوەی بتوانی بە دروستی کار بە بەرنامەکە بکەیت، پاشان دەبینین پەنجەرەی بەرنامە سەرەکیەکەت بۆ دەکرێتەوە وەکو لە (وێنەی ژمارە ٢) دیارە.

* ئێستاش شیکردنەوەی ڕێگای کارکردنی بەرنامەکە بە پێی ئەو ژمارانەی دانراون لەسەر وێنەکە .

هەڵسە بە خستنە نێوی سیدیە تێکچووەکە بۆ ناو سیدی درایڤەرەکە، وە هەڵسە بەدیاریکردنی سیدی درایڤەکە بە کلیک کردن لەسەر دوگمەی ژمارە ١٢ وە لیستی درایڤەکانت بۆ بەدیار دەکەوێت کەهەن لەناو ئامێرەکەت، پاشان کلیک بکە لەسەر دوگمەی ژمارە ١١ بۆ دیاریکردنی شێوەی ڕەش کردنەوەی ئۆتۆماتیکی، ئەمانیش دوو جۆرن :-

A MODE بۆ ئەو سیدیانەی کە تۆمارکراون بە سیستەمی ISO – ٩٦٦٠ FORMAT .

B MODE بۆ ئەو سیدیانەی کە تۆمارکراون بە سیستەمی UDF FORMAT.

ئەگەر تۆ سیستەمی مەلەفاتی خەزنکراوت زانی لەسەر سیدیەکە ئەوا دەتوانی ئەم خاڵە واز لێبێنی، وە دیاریکردنەکە هەڵبژێریت بە کلیکی دوگمەی ژمارە ٩، ١٠، کلیکی دوگمەی ژمارە ١٣ بکە بۆ نوێ کردنەوەی زانیارییەکانی دیسکەکە، پاشان کلیکی دوگمەی ژمارە ١٩ بکە بۆ دیاریکردنی شوێنی مەلەفەکان پاش دەرهێنانیان، پاشان کلیکی ژمارە ١٨ بکە بۆ دیاریکردنی ئەو مەلەفانەی دەمانەوێ




وێنەی (٢)

بیان گەڕێنێتەوە، پەنجەرەیەکمان بۆ بەدیاردەکەوێت بۆ دیاریکردنی مەلەفەکان و فۆڵدەرەکان یاخود هەموو دیسکەکە، دوایی کلیکی دوگمەی ژمارە ٢٢ دەکەین بۆ دەرهێنانی مەلەفەکان، پاش کۆتایی هێنان بەم کردارە شاشەیەکمان بۆ دەکرێتەوە، بۆ پێراگەیاندنی سەرکەوتنی کرداری گەڕاندنەوەکە، ئەگەر بەرنامەکە سەرکەوتوو نەبوو لە گەڕاندنەوەی مەلەفەکان ئەوا هەڵسە بە زیادکردنی هێزی گەڕانەکە بەهەر چوار دوگمەی ژمارە ٣٠، تێبینی دەکەین هەرچەند هێزی گەڕانەکە زیاد بکەیت ئەوا کاتی گەڕاندنەوەی زانیارییەکان زۆرتر دەخایەنێت .

## کاری دوگمەکان بە پێی ژمارەیان

١. بۆ هەڵگرتنی لیستی مەلەفەکان بە پێی پاراستنیان .

٢. بۆ پاراستنی لیستی مەلەفە هەڵبژێردراوەکان، بۆ ئاسانی گەڕانەوە بۆی لەکاتێکی تردا .

٣ و ٤ و ٥ – کرداری کۆپی و برین و دانانەوەیە .

٦– بۆ گەڕاندنەوەی دوگمەکانی بەرنامەکە بۆ حاڵەتی ئاسایی خۆی وە ڕەش کردنەوەی لیستی مەلەفەکان .

٧– مەلەفی هاوکاری .

٨– دەرچوون .

٩ و ١٠ – دیاریکردنی شێوەی ڕەش کردنەوەی دەستی .

١١– دیاریکردنی شێوەی ڕەش کردنەوەی ئۆتۆماتیکی .

١٢– دیاریکردنی شێوەی درایڤەکە .

١٣– نوێ کردنەوەی زانیاری دیسکەکە.

١٤ – نوێ کردنەوەی زانیاری بەشەکان بە تەنها .

١٥– دیاریکردنی بەشەکان لەسەر سیدی ئەگەر زیاتر لەبەشێک هەبوو .

١٦– بۆ دیاریکردنی بەشی سەرەکی وە بەلاوەخستنی بەشەکانی تر .

١٧– دوگمەی سەرەوە بۆ دیاریکردنی باشترین ناو بەشێوەیەکی خۆیی، وە دوگمەی خوارەوە بۆ دیاریکردنی ناوی کورت بەتەنها لەکاتی ڕەش کردنەوەی دیسکەکە .

١٨– دوگمەی زیادکردنی مەلەف یاخود فۆڵدەر .

١٩– دیاریکردنی شوێنی مەلەفەکان پاش دەرهێنان .

٢٠– بۆ ڕەش کردنەوەی مەلەفی هەڵبژێردراو لەلیستی ژمارە ٢٣ .

٢١– بۆ ڕەش کردنەوەی هەموو مەلەفەکان .

٢٢– بۆ دەستپێکردنی کرداری گەڕاندنەوە.

٢٣– لیستی مەلەفەکانی هەڵبژێردراو .

٢٤– لەکاتی نەتوانینی گەڕاندنەوەی هەموو زانیارییەکانی مەلەفێک ئەوا بەرنامەکە هەڵدەسێ بەگەڕاندنەوەی ئەو زانیاریانەی کە دەتوانێ بیگەڕێنێتەوە، وە وازهێنان لەو زانیاریانەی کە نەیتوانی بیگەڕێنێتەوە، وە دروستکردنی فۆڵدەرێک بۆ ئەو زانیاریانە لەکاتی داگرتنی ئەم دوگمەیە .

٢٥– دوگمەی چۆنایەتی کە لە هەندێ حاڵەتدا زۆر گرنگە، ئەویش بەجێ بەجێکردنی ڕێگایەکی تایبەت بۆ گەڕاندنەوەی داتاکان، بەڵام کرداری گەڕاندنەوەکە زۆر هێواش دەکات .

٢٦– دوگمەی چۆنایەتی شێوەکانی دوگمەکانی ژمارە ١٠ .

٢٧– دوگمەی وازهێنان لە ناونیشانی مەلەفەکان، وە مەلەفەکان دەگوازرێنەوە بۆ فۆڵدەری دیاریکراو ڕاستەوخۆ .

٢٨– دوگمەی پاڵێوراوی قورسی گەڕانەکە، ئەمەش دەست بەسەر ڕێگای پشکنینی مەلەفەکان دەکات، لەڕێی بەرنامەکەوە وە واباشترە لەسەر حاڵەتی LOW بێت، تەنها لەو حاڵەتانەدا نەبێت کە هەڵە هەبێت لەکرداری گەڕانەوە، لەو کاتەدا لەسەر حاڵەتی MED OR HIGH دابنرێت .

٢٩– دیاریکردنی ئاستی گەڕان لەهەر یەکێک لەشێوەکانی ٩ و ١٠ .

٣٠– هێزی گەڕانی زیاتر بەبەکارهێنانی هەر چوار دوگمەکە .

سەهمی FEED BACK LEVEL /

کردارێکی بیرکاری یە کەوا بەرنامەکە بەکاری دەهێنێت بۆ گەڕاندنەوەی مەلەفەکان لەسەر دیسک، کە ئەمەیان کردارێکی زۆر گرنگە، وەهەر چەند ئاستەکە زیاد بکرێت ئەوا ماوەی گەڕانەکە زیاد دەبێت .

سەهمی RETRY LEVEL /

بۆ دیاریکردنی ئاستی گەڕاندنەوەیە لەسەر داتاکان، بۆ هەوڵ دانیان بۆ گەڕانەوە .

# QUICK TIME چییه و بۆچی بەکار دێت؟

ئا: سەروین عبدالله

بەرنامەی کویک تایم QUICK TIME بە گشتی لەگەڵ دانیشتنی هەر ویندۆزێک خۆی دادەبەزێتە سەر ئامێری کۆمپیوتەر بەمەش بڕێک لە نەقسی ویندۆز پڕدەکاتەوە لەبەر ئەوەی ویندۆز هەندی فایلی تایبەتی تێدایە ئەگەر بەرنامەی QUICK TIME نەبێت ئەم پارچە ڤیدیۆیانە بەهیچ شتێک کارناکەن هەروەها لەکاتی بەکارخستنی ڤیدیۆی مۆبایلەکان بەگشتی زۆربەیان بە بەرنامەی QUICK TIME کاردەکەن وە هەندێ جار کە ویندۆز دادەنرێت ئەم بەرنامەیە لەگەڵ ویندۆزەکە نیە هەوڵبدە پەیدای بکە و دایبە زێنە بۆ سەر کۆمپیوتەر لەبەرئەوەی زۆر پێویستە هەروەها بەکار هێنانی زۆر ئاسانە، بەرنامەکە دەکەیتەوە پاشان لەسەرەوە FILE دەکەیتەوە ئینجا OPEN MOVIE IN NEW PLAYER لێدەدەیت ئینجا لیستی هاردەکان دێت تۆش شتی پێویست OPEN دەکەیتە ناو بەرنامەکە (وێنە ١).



وێنەی (١)

# وەرگێرانی فایلی جۆری DVD بۆ جۆری ڤیدیۆ سیدی بە شێوەیەکی ئاسان لەڕێگای بەرنامەی Win Avi

ئا: نەریمان فرۆکەوان

بەڕێزان زۆرجار ئێمە گیرو گرفتی ئەوەمان دێتە پێش کە سیدێک لە ئەنتەرنێت داوون لۆد دەکەین یاخود سیدییکی گرنگمان بۆ دێت لە دەرەوە دەبینین گرفتی ئەوەی هەیە کە کارناکات لەسەر ئامێری ڤیدیۆ سیدیەکانمان یاخود لەسەر کۆمپیوتەر نابێتەوە ئەو کاتە پێویستمان بە بەرنامەیەک دەبێت کە ئەم جۆرە فایلەمان بۆ بگۆڕێت بۆ جۆرێک کە سودی لێوەربگیرێت بەرنامەی WIN AVI ئەم کارەئەنجام دەدات جگە لەوەش دەتوانێت بەپێچەوانەوەش ئەم کارە ئەنجام بدات واتا گۆڕینی جۆری ڤیدیۆ سیدی بۆ جۆری دیڤیدی هەروەها دەتوانی فایلی جۆری AVI WMV MV1 WMA MPEG2 بگۆڕێت بۆ ڤیدیۆ سیدی ئەنجام دانی ئەو کارەش یەکجار ئاسانە سەرەتا پاش دابەزاندنی ئەو بەرنامە لەسەر کۆمپیوتەرەکانمان دیین بەرنامەکە دەکەینەوە دەبینین چەند چەماوەیەکی تێدایە کەهەر یەکەو کاری تایبەت بەخۆی

ئەنجام دەدات لەلای ڕاست لە خوارەوە لەناو کەوانەیەک DVD دیارە بەماس جارێک کلیکی لەسەردەکەین دەبینین لیستی هاردەکان دەبێتە بەم شێوەیە وێنە ١ پان ئەو پارچە ڤیدیۆیەی کە دەمانەوێ بیگۆڕین یەکجار کلیکی لەسەر دەکەین ئینجا OPEN لێدەدەین وێنە ٢ پاشان لیستێکی تردەبێتەوە لە بۆشایی خوارەوەی ئەم لیستە DVD نوسراوە یەکجار کلیک لەسەر ئەم بۆشاییە دەکەین DVD یەکە دەبێتەوە کە لە ژێرەوەی MINI DVD VCD MPG1 MPG2 هەیە ئێمە دێین VCD هەڵدەبژێرین ئینجا لە ژێرەوە پیتی(ب) لێدەدەین پاشان دەوەستین تا تەواو دەبێت (وێنە ٣).



وێنەی (٢)



وێنەی (٣)




**وەرگێڕانی:- لمیاء عابد**

لەوانەیە ئەم ڕوداوە بۆ ئێوەش ڕویدا بێت ... نیازتان هەیە فایل یان فۆلدە رێک بسڕنەوە بەڵام ڕوو بە ڕووی ئە م کێشەیەی خوارەوە دەبنەوە.....

CANNOT REMOVE FOLDER TEMP IT IS BEING USED BY ANOTHER PERSON OR PROGRAM

ئەگەر ئێوە دڵنیان بە پێچەوانەی ڕای ئەم پەنجەرەیە فایل یان فۆڵدەرەکەت بەکار نایەت ئەتوانیت لەم کاتانەدا بۆ ڕزگار بوونت لەم کێشەیە ئەم ڕێگایەی خوارەوە بەکاربهێنە:-

١-تە واوی بە رنامە کراوەکانی ناو کومپیوتەرەکەت داخە .

٢- COMMAND PROMPT ی بکەرەوە .

٣-TASK MANAGER بە RIGHT-CLICK کردن لەسەر TASKBAR وە هەڵبژاردنی ووشە ی TASK MANAGER وە یا داگرتنی CTRL-SHIFT-ESC بکەرەوە.

٤- برۆ بۆ برگە ی PROCESSES وە ووشەی EXPLORER. EXE هەڵبژێرە لە دوایدا END PROCESS دابگرە.

٥- بەبێ ئەوەی TASK MANAJER دابخەی برۆرە پەنجەرەی COMMAND PROMPT.

٦- لە شریتی زانیارییەکان ئەو فا یلەی کە مەبەستتە بە فرمانی DELETE بسڕەوە .

٧- دیسان بگەڕێوە سەر TASK MANAGER لە برگەی APPLICATIONS دوگمەی NEW TASK دابگرەو EXPLORER. EXE جێ بە جێ بکە.

سەرچاوە :- WWW.IRANBESTLINK.COM

# گەڕاندنەوەی زانیارییەکان پاش کرداری فۆرمات کردن




وێنەی (١)

ئا: جوان محمد عولا - شەقلاوە

بەڕێـزان... زۆر جـار وا ڕێدەکەوێت کەوا چەند زانیارییەکی بەسـوودمان لەسـەر ئامێری کۆمپیوتەر لـێ ڕەش دەبێتەوە، بەهەڵـە بێت یاخـود بەهەڵەی کەسـانێکەوە بێـت، لەبەرامبەر ئەمـەدا چەندیـن بەرنامـە دیزایـن کـراون بۆ ئەم مەبەسـتە واتـە بۆ گەڕاندنـەوەی زانیارییەکان پـاش ڕەش کردنەوەیان، بەلام ئاسـانترین و چاکترین بەرنامە بۆ ئاسـتی گەڕاندنەوەو بەکارهێنانیدا بریتیە لەبەرنامەی FINAL DATA .

## باسکردنی بەرنامەکە

لە پێشـەکیدا هەڵدەسـین بە دروسـتکردنی مەلەفێک لەسەر دسـکی D، وە ناوێکی لێ دەنێین بۆ نمونە سـەفین، وە پاشان مەلەفە دروستکراوەکە ڕەش دەکەینەوە (وێنەی ژمارە ١)وە لە RECYCLE BIN یش لادەبەین .

ئێسـتا هەڵدەسـین بە هێنانەوەی ئەم مەلەفە بە بەکارهێنانی ئەم بەرنامەیە .

پاش دابەزاندنی بەرنامەکە بۆ سەر ئامێرەکەت هەڵدەسین بە کردنەوەی بەرنامەکـە، پەنجەرەیەکمان بۆ دەکرێتەوە (وێنەی ژمـارە ٢)، کلیکـی دوگمەی ژمارە ١ دەکەیـن دەبینین هەموو دیسـکەکانمان پیشان دەدات، کامە دیسک مەلەفەکەمان لەسەر خەزن کردبوو سێلێکتی دەکەین وە OK دەکەین، وە بەرنامەکە دەست دەکات بە پشکنینی ئەم دیسکە، پاش ئەمە پەنجەرەیەک بەدیاردەکەوێـت کلیکـی OK بکـە، تا بەرنامەکە تـەواو دەبێت لەگـەڕان بـە دوای مەلەفـی ڕەش کراوە، پـاش کۆتایی هێنان بەگەڕانەکـە ئەوا هەڵدەسـێ بە پیشـاندانی هەمـوو مەلەف و فۆڵدەرەکانـی نێو دسـکی هەڵبژێردراو (D)لـە خانەی ژمارە ٥ (وێنـەی ژمـارە ٣)، لە نێو مەلەف و فۆڵـدەرەکان فایلی لابراو بەدیـار دەکـەوێ، دوایـی پەنجەرەیەکمان بـۆ دەکرێتەوە وە داوای شوێنی خەزن کردنی فایلەکەمان لێدەکات (وێنەی ژمارە ٤)، بـەلام بیزانە ناتوانـی لەهەمان دیسـکدا خەزنی بکەیتەوە، لەبەرئـەوە دیسـکی C هەڵدەبژێریـن، پـاش ئەمـە بەرنامەکە دادەخەین، پاشـان بـۆ بینینی مەلەفەکە دەچین بۆ دسـکی C، دەبینین مەلەفەکە لەوێدا خەزن کراوەتەوە .

* ئەگـەر ئێمـە نـاوی مەلەفەکەمـان زانی ئـەوا ڕێگایەکی خێراتـر هەیە بۆ گەڕاندنەوە، کلیکی دوگمەی ژمارە ٣ دەکەین پەنجەرەیەکمان بۆ دەکرێتەوە، ناوی مەلەفەکە دەنووسـین وە کلیکی FIND دەکەیـن، دوای گەڕان مەلەفەکە بەدیار دەکەوێت لەخانەی ژمارە ٥، وە بەهۆی کلیکی ژمارە ٤ دەتوانین هەڵسین بەدیاریکردنی شێوەی بینینی مەلەفەکان لەخانەی ژمارە ٥، واتە بەشـێوەی لیسـت بێت یاخود بچووک و گەورە یان بەشێوەی درێژکراوەبێت .

FinalData NT v1.0

File Edit View Repair Help

1 2 3 4 5

Select Drive

Logical Drive | Physical Drive

Floppy (A:)
(C:)
(D:)

OK
Cancel
Find Format

FileSystem file saved:




Ready kameran7605@yahoo.com

وێنەی (٢)

Select directory to save

FAT : FAT1
Save
Cancel
Directory: C:\shaqlawa

A:\
C:\
D:\
E:\
F:\
Network

Documents and Setting
FOUND.000
FOUND.001
FOUND.002
FOUND.003
Inetpub
Program Files
Recycled
System Volume Informa
WINDOWS
AUTOEXEC.BAT
boot.ini
CONFIG.SYS
IO.SYS

kameran7605@yahoo.com

وێنەی (٤)




وێنەی (٣)




وێنەی (١)

# چۆنیەتی گواستنەوەی فایلی word بۆ Mac

**ئا: دارەوان نامق**

خۆشەویستان کۆمپیوتەری ماکنتۆش کۆمپیوتەرێکی تایبەتە بۆ بەکارهێنانی دیزاین و کاری ڕۆژنامە و گۆڤار، نەخشە کێشان، بۆ زۆر جاری وادەبێت کە نوسینێکمان دەبێت لە WORD و دەمانەوێت بیگوازینەوە بۆ ماکنتۆش بەلام ناخوێندرێتەوە، بۆیە پێویستتان بەم زانیاریە دەبێت، ئەمەش هەنگاوەکانی ئەو کردارەیە .

سەرەتا دەچینە سەر بەشیSTART دواتر لەوێشەوە بچۆرە سەر بەشی SETTINGS دواتر بچۆرە سەر بەشی CONTROL PANEL لەوێشەوە بۆ سە هێمای LANGUAGE و لەوێشەوە بۆ ADVANCED لە ناو ئەو بەشەدا دەبینین چەند چوار گۆشەیەک هەیە ئەو چوار گۆشانە دەبێت دیاری بکرین واتا هێمای ڕاست یان لەسەر دابنرێت لەو کاتەدا پێویستیتان بەسیدی ویندۆز دەبێت و لە کۆتاییدا جێ بە جێکردنی فەرمانەکە داوای ریستارت کردنەوەی کۆمپیوتەرەکەت لێ دەکات و دەتوانن بۆ بەجێ گەیاندنی فەرمانەکە ئەو کارە ئەنجام بدەن (وێنە ٢).

لەدوایدا دەچینە سەر WORD لە SAVE AS دەچینە جۆری خەزن کردنی وۆردەکە جۆری PLAIN TEXT هەڵدەبژێرین و خەزنی دەکەین (وێنە٣).

لەدوایدا دەیگوازینەوە بۆ کۆمپیتەری ماکنتۆش دەبینین بەهەمان جۆری وۆردەکە دەکرێتەوە.

# هەنگاوە گرنگەکانی دروست کردنی سایتێکی بازرگانی


**هێمن محسین**


**زنجیرەی یەکەم**

تۆری ئەنتەرنێت پێک هاتووە لە ملیۆنەها سایت و لە ملیۆنەها ماڵپەڕی جۆراو جۆر لە تاکە کەسیەوە تاکو حکومی و ناوەندو سەنتەرە گشتییەکان کە سایتی رۆشنبیری، فەلسەفی، تەندروستی، کۆمەڵایەتی، زانستی، ئۆرگارنی رێکخراوەکان و هتد لەخۆوەدەگرێت. سایتە بازرگانیەکانیش بەهەمان شێوە بەشێکن لە تۆڕی ئەنتەرنێت جا لێرەدا سایتێکی بازرگانی لە ناو ملیۆنەها سایتی تری بازرگانی و سایتەکانی تر چۆن دەردەکەوێت یان چۆن سەرنج ڕاکێش دەبێت چونکە تۆ لەم سایتە دەتەوێت شمەکەکانی خۆت نمایش بکەیت، کاڵاکان لە رێگای ئەنتەرنێتەوە بفرۆشیت، ئەمەش ورد بینیەکی زۆری دەوێت چونکە ئەم سایتە وەکو دوکانێکی ناو بازاڕێک دەرناکەوێت چونکە وەکو باسم کرد ئەنتەرنێت پێک هاتووە لە ملیۆنەها سایت . لە سەر ئەم بنچینەیە کۆمەڵێک شارەزاو پسپۆرەکانی بواری نەخشەسازی سایتەکان چەند هەنگاوێکیان دارشتوە بۆ دروست کردنی سایتە بازرگانیەکان بۆ ئەوەی بتوانرێت سایتێکی سەرنج ڕاکیش و سایتێکی تەواوو شکلێکی بازرگانی وەربگرێت بۆ ئەمەش پێویستە کە :

١- هەنگاوی یەکەم پڕدەکرێتەوە لە دانانی پلانێک بۆ کاروبارەکانی ئەنتەرنێت بۆ ئامادەکردنی راپۆرتێک لە سەر سایتە بازرگانیەکان و دەست نیشان کردنی ئامانجەکان و تاکو بتوانیت لەم سایتەدا تەواوی مەبەستەکانت لەخۆبگرێت و بتوانیت زۆرترین میوان بۆ سایتەکەت بانگهێشت بکەیت و زۆرترین فرۆشتن هەبێت.

٢- دەبێت لەم سایتەدا رەچاوی خزمەت گوزاری و ئاسانکاریەکانی میوانەکان بکەیت لە هەمان کاتدا دەبێت ئەوەش بزانیت بازرگانی نێودەوڵەتی وەکو بازرگانی ناوخۆ وانیە بۆ نمونە




کەسێکی ئەمریکی لە کڕینی کاڵا جیایە لە گەڵ کەسێکی هیندی تۆ دەبێت حسابی تێگەیشتن و ڕونکردنەوەی کاڵاکان بکەیت بۆ میوانەکانت لەگەڵ ئەوەی نوسین و زمان بە هەند وەردەگریت . ئاسانکاری لە تێگەیشتنی نرخی کاڵاکان هەبێت

٣- دەبێت لە هەنگاوی سێیەم ڕەچاوی دانانی میزانیەو پارە تەرخان بکەیت بۆ بەڕێوەبردنی ئەم سایتەو دانان و گۆڕانکاری کردن بەپێی ئەو گۆڕانانەی کە لە بازاڕدا ڕودەدەن . سەرباری چاکردنەوەو نەهێشتنی کێشەو گرفتەکانی سایتەکەو پێشخستنی بە بەردەوامی .

٤- لە هەنگاوی چوارەم پێویستە هاوبەشیەک هەبێت لەسەر هەموو بەشەکانی کۆمپانیاکە لە بەشداریکردن لەم سایتەو دەوڵەمەندکردنی و بە جۆاوجۆرکردنی سایتەکە تاکو بتوانرێت کە ئەم پڕۆژەیە ببێتە پڕۆژەیەکی گشتیو تەواو بەبێ کەم و کوڕی .وە بەشداریکردن لە گەڵ سایتی تری بازرگانی تاکو بتوانرێت هەم کاڵای خۆت سەرف بکات هەم بتوانرێت بازرگانیەکی ئەلیکترۆنی سەرکەوتوو بکەیت.

٥- دەبێت ئەم سایتە بەشێوەیەکی وا پێشکەوتوو نەخشەی بۆ بکێشرێت کە بتوانرێت لە گەڵ هەموو پەڕە هەڵدەرەوەکان بکرێتەوەو بەبێ ئەوەی هیچ لە فایلەکان یان بەشێک لە کاڵاکان دیار نەبن یان سایتەکە بەتەواوەتی نەکرێتەوەو ببێت هۆی مەلەل بونی میوانەکە، لە هەمان کاتدا وردبینی لە نەخشەسازیەکە هەبێت تاکو هاوبەش بێت لەگەڵ هەموو کۆمپیوتەرێک و بەرنامەیەک ...





# کردنەوەی ماڵپەڕێکی نوێ بەناوی zebo بۆ خزمەت گوزاریەکانی ئەنتەرنێت



وێنەی (١)



وێنەی (٢)

## ئا: هەڤاڵ کاروان

خۆشەویستان کردنەوەی ئەم ماڵپەرە تازەیە بۆ خزمەت گوزاریەکانی ئەنتەرنێت بەشێوەیەکی زۆر خێرا وە فراوانی (2MG) بایت بۆ وەرگرتنی ئیمەیل EMAIL دەگرێتەوە خۆی و زۆر دورە لە تووش بوونی ڤایرۆس و دەتوانرێت بەهەموو زمانێک بنوسرێتەوە و بە تایبەتی بە زمانە شیرینەکەی خۆمان و بەشداری کردن لەم ماڵپەڕەدا بەم شێوەیەیە (وێنە٢).

سەرەتا دەبێت ئەم خانانە پربکرێتەوە کە لە وێنەی ژمارە ١ دا دیارە و لە دوای پڕ کردنەوەی بۆشاییەکان کە زانیاری تایبەتین دەبێتە ئەندام لەم ماڵپەرە و ئەوەی شایەنی باسە ئەگەر خاوەن بەشداربوو لە YAHOO ئیمەیلی هەبوو وە لە MSN یش ئەوا ئەم ماڵپەرە بۆی کۆدەکاتەوە لەناوە خۆی (وێنەی ٣).

وێنەی (٣)

# دروستکردنی نوێ ترین میمۆری بەناوی ipod

ئازیزان ئەم میمۆریە تازەیە کە قەبارەیەکی زۆر بچوکی هەیە و توانەیەکی زۆری هەیــە بۆ خەزن کردنی بــە فراوانی میمۆریەکە دەگاتە 60 GB ە بۆ هەڵگرتنی فایلات، بەشــێوەکی سەرەکی ئەم میۆریە چوار کار دەکات کاری وێنەگرتن وە ڤیدیۆیی وە کاری دەنگ بەهەموو جۆرەکانیەوە وە کاری هەڵگرتنی زانیاریەکان.

# هەموو شتێک لە ئەنتەرنێت بدۆزەرەوە

ئەژین شێرکۆ
بەشی دووەم

دەتەوێت لـە ئەنتەرنێت بەدوای چیـدا بگەڕێیت ئارەزوی چ دەکەیت ئەوا پێویسـتت بە ماڵپەرەکانی گەڕان هەیە من لێرەدا هـاوکار دەبـم بۆ ئەوەی بتگەینمە ناو هەمـوو ئەو بزوینەرانە کـە تۆ ئارەزویـان دەکەیـت بۆ نمونـە من ئـارەزوی گەڕان بەدوای بەرنامەدا بکەم یەکێکی تر حەز دەکات زانیاری لەسەر ماڵپەرکانـی تایبەت بە کۆمپیوتـەرو ئەنتەرنێت پەیدا بکات بۆ ئەوەی بگەیتە هەرچی دەتەوێت بەدەستی بێنیت سەردانی ئەم سایتانە بکە :

**بەناوبانگترین ماڵپەرەکانی گەڕان**

**بزوێنەرەکانی گەڕان بە دوای ڕۆژنامەو گۆڤار**

/WWW.BALTIMORESUN.COM
/WWW.SUNTIMES.COM
/WWW.CONTRACOSTATIMES.COM
/WWW.FREEP.COM
/WWW.LASVEGASSUN.COM
/WWW.LATIMES.COM
/WWW.STARTRIBUNE.COM
/WWW.NYPOST.COM
/WWW.POST-GAZETTE.COM
/WWW.MERCURYCENTER.COM
/WWW.SEATTLETIMES.COM
/WWW.BOSTON.COM
/WWW.CINCINNATI.COM
/WWW.DETNEWS.COM
/WWW.HERALD.COM
/WWW.WASHTIMES.COM
/WWW.WASHINGTONPOST.COM

**بزوێنەرەکانی گەڕان بەدوای هونەری چێشت لێنان**

/WWW.ALLRECIPES.COM
/WWW.COOKINGLIGHT.COM
/WWW.COOKING.COM
/WWW.FOOD.EPICURIOUS.COM
/WWW.GLOBALGOURMET.COM




/WWW.FOOD.HOMEARTS.COM
WWW.LYCOS.COM/SEARCH/RECIPEDIA.HTML
/WWW.MAYOHEALTH.ORG
/WWW.MY-MEALS.COM
/WWW.ONLINE-COOKBOOK.COM
/WWW.RECIPECENTER.COM
/WWW.RECIPES.WENZEL.NET
/WWW.ICHEF.COM
/WWW.KITCHENLINK.COM
/WWW.ASTRO.CFAC.UK
/WWW.YUMYUM.COM

**چیت لەئەنتەرنێت دەوێت لەم بزوێنەرانە هەیە الكمبيوتر و الانترنت**

WWW.MSFN.ORG
WWW.WINBETA.COM
WWW.IEXBETA.COM
WWW.NEOWIN.NET
WWW.TECH-CRITIC.COM
WWW.WINCUSTOMIZE.COM:
WWW.THEMEXP.ORG

WWW.PACKETNEWS.COM
WWW.XBETAS.COM
WWW.FILEMIRRORS.COM
WWW.CNET.COM
WWW.ZDNET.COM
WWW.WEBATTACK.COM

**بزوێنەرەكانی گەڕان بەدوای دیزاین**
WWW.GUISTUFF.COM

**باكگراوندی شاشەی كۆمپیوتر**
WWW.DESKTOPWALLPAPERS.NET
WWW.DIGITALBLASPHEMY.COM

WWW.ATOMOVERRIDE.COM

**بزوێنەرەكانی گەڕان بەدوای چارەسەركردنی كێشەی كۆمپیوتەر**
WWW.EXPERTS-EXCHANGE.COM

**بزوێنەرەكانی گەڕان بەدوای كۆمپیوتەرو فێربونی بەرنامەكانی كۆمپیوتەر**
WWW.C4ARAB.COM
WWW.MONTADA.COM
WWW.ARABSGATE.COM

**بزوێنەرەكانی گەڕان بەدوای دابەزاندنی بەرنامەكانی كۆمپیوتەر**
WWW.ABSBA.COM
WWW.DOWNSEEK.COM
WWW.DOWNLOAD.COM
WWW.ALBARGOTHY.NET/PRO/SITE.HTM
HTTP://LIAOKIA.COM/SOFTW_EN/D_INDEX.HTM





# چی بکەین پێش ئەوەی بچینە سەر تۆڕی ئەنتەرنێت؟


دەریا حسێن- سلێمانی


وەکـو لای هەموومان ڕون و ئاشـکرایە کـە ئەنتەرنێت لەم سەردەمەی ئێستادا بە گەورەترین و پێشکەوتوترین داهێنەری سـەردەم دادەنرێـت بەبێ هیـچ گومانێکیـش ئەنتەرنێت پڕ لە زانیاری و بابەت و بۆچون و بیرو کارو کرداری باش و بەسود پرزانیارتریـن ئورگانی سەردەمیشـە . بەلام لـە هەمان کاتدا بەدەر نیە لە شـتی خراپیش وەکو دزو سـیخور تێکدەرەکانی کۆمپیوتـەر و تۆڕەکانی ئەنتەرنێـت، جا بۆ ئەوەی پێش چونە نـاو تـۆڕی ئەنتەرنێت چەنـد زانیاریەکمان هەبێـت بۆ ئەوەی ئێمـەش نەکەوینە داوی ئەو جـۆرە تێکدەرانەو بەهۆیانەو لەو خزمەتگوزاریە گەورەیە خۆمان دورنەخەینەوەو بێ بەش نەبین تیایدا، بە چەند خاڵێک باس لەم کارو ڕێنمایی و کردارانە دەکەین کـە تایبەتن بە هەر کەسـێک کە سـەردانی ئەنتەرنێت دەکات پێش هەر سـەدانێک چی بکات باشـە بەتایبەتـی بەکارهێنانی

ئەنتەرنێت لە قاوەخانەکان و سەنتەرەکانی ئەنتەرنێت بێت :

یەکەم :- بە هیچ شێوەیەک وێنەی تایبەتی خۆت یان خێزانت یـان هاورێت لە نـاو کۆمپیوتەر بە جێ نەهێڵیـت بەڵکو لەناو فلۆپـی یان فلاش هەڵیـان بگرەو دڵنیابە کە لەنـاو کۆمپیوتەر نەماوەو سـراوەتەوە تەنانـەت لەناو ریسـایکل باینیش بێت . بەتایبەتـی بۆ کچـان کە سـیخورەکانی ئەنتەرنێـت ئەمجۆرە وێنەو شتە تایبەتانە دەکەنە ئامانج .

دووەم :- بەهیـچ شـێوەیەک هیچ لە زانیاریـە تایبەتیەکانت وەکـو ژمارەی تەلەفۆن یان ژمـارەی بانک یان نامەی تایبەت یان هەرشـتێکی تاکە کەسی بەنرخ لەناو کۆمپیوتەرکە سەیڤ نەکەیـت و هەڵـی نەگریت، چونکـە زۆر جار ئەم پرسـیارانە دەکرێـن ئایا هەمـوو کۆمپیوتەرێک ئامانجە بـۆ برین و دزی لێکردن و بردنی زانیاریەکانی ناوی ؟ بەدڵنیاییەوە دەڵێین بەڵێ. لەم گۆڤارەدا باسی ترۆجان و سیخوری کۆمپیوتەر کراوە.

سـێیەم :- پاراسـتنی پاس وۆردە لەگەڵ ناوی خۆت بۆ ئەم مەبەسـتەش لـە هـەر ماڵپەرێک دڵنیـا نەبویت ئـەوا ناو پاس وۆردی خۆتی بۆ مەنوسە لە گەڵ تەواو بونیشت پاس وۆردت لەناو هەموو هیسـتۆری و کۆمپیوتەر رەشکەرەوە . لە هەمان کاتدا تاکو دەتوانیـت زوتر کردارەکان جێبەجێ بکرێن بە هیچ شـێوەیەک لەگەڵ رێنمایی بەرنامەکانی خێرا پەیوەندی کردن دا مەبن کە لەسـەر بەشـێک لە پۆسـتە ئەلیکترۆنیەکان داوای سـەیڤی ناوو پاس وۆرد دەکەن چونکە کاتێک سـەیڤ دەکات لەناو بەشـێکی کۆمپیوتەر سەیڤ دەبێت بەمەش ئەم فایلانەی ناو کۆمپیوتەر توانای کردنەوەیان ئاسانەو کۆمپیوتەر بەسانی دەبردرێت .

چـوارەم :- ئەگـەر ئەنتەرنێـت لەماڵـەوە نەبێت ئـەوا پێش چونت بۆ سـەنتەری ئەنتەرنێت تەواو ئامادە باشی وەرگرە لە فکرو بۆچون و لە سەردانی کردنی سایتەکان و لە بەهێواشی دۆزینـەوەی ئـەو بابەتانەی کـە دەتەوێت وە لەهەمـان کاتدا کاتێکی زۆری دەگەرێتەوە کاتێک بە دوای زانیاریدا دەگەرێیت لە ناو ئەنتەرنێت .

پێنجـەم :- کە کابینەیەکت هەڵبژارد یەکسـەر کۆمپیوتەرەکە ریسـتارت بکە بۆ ئەوەی ئەگەر هـەر هەڵەیەک هەبێت یان بۆ ئـەوەی کۆمپیوتـەر بچێتەوە بارێکی تازەی ئیشـکردنەوەو لە بـەر ئەوەی زۆربـەی کۆمپیوتەرەکان دیپ فریـز کراون ئەوا کۆمپیوتەر پاک دەبێتەوە لە هەموو فایلەکان و کارکردنی پێش خۆت .

شەشـەم :- ئەبێـت دوبـارە ئـاگاداری کات بیـن چونکە لە کوردسـتان کارکردن لە ئەنتەرنێت بـە کاتژمێرە تۆش دەبێت کەمترین کات زۆرترین زانیاری وەرگریت .

# مانای ئەو ژمارانەی کە لەکاتی پەیوەندی بە ئەنتەرنێتەوە دەردەکەون لەکاتی بوونی هەڵە


حسن عمر حسن


(زنجیرەی چوارەم)

٧٠١ – مۆدێم لـە خێرایـی یەکی نا دروسـت دایە بۆ پەیوەندی کردن.

٧٠٣ – پێویسـتە لـە سـەرت تـەواوی زانیاریەکانـت دروست بنوسیت چونکە مۆدێم رێگای پەیوەندیت نادات .

٧٠٤ – ژمارەی وەڵامی پەیوەندیت نا دروستە.

٧٠٥ – باری نێرەرت نادروستە.

٧٠٧ – هەڵەیەک هەیە پەیوەندی بە پرۆتۆکۆلی X25

٧٠٨ – مـاوەی رێـگا پێدانـت تـەواو بەهـۆی نەمانی یەکەوە.

٧٠٩ – هەڵەیـەک لە پـاس وۆرد هەیە، یان ئەوتا پاس وۆردەکەت کورتە.

٧١٠ – پێویسـتە بـەدوای زنجیـرەی هەنگاوەکانـی پەیوەندی بگەرێیت .

٧١٥ – هەڵەی زۆر دروسـت بوونە بە هۆی هێواشـی و خراپی هێڵەوە.

٧١٦ – IP تایبەت بە پەیوەندیت هەڵەیە.

٧١٧ – IP تایبەت بە پەیوەندی لە تۆری کۆمپیوتەرەکەت نیە.

٧١٨ – چـاوەرێ بـە تـا کۆمپیوتـەری ناوەنـد وەڵام دەدات.

٧١٩- هێڵـی ئەنتەرنێـت لـە کۆمپیوتـەری ناوەندەوە پچراوە.

٧٢٠ – پەیوەندیەکـەت شکسـت دێنـی بەهۆی نەبونی هیچ پرۆتۆکۆلێک لەگەڵ کۆمپیوتەری ناوەند.

٧٢١ – کۆمپیوتەری ناوەند وەڵامی نیە.

٧٢٣ – ژمارەی تەلەفۆنی پەیوەندی زۆر درێژە.

٧٢٦- ناتوانیـت پرۆتۆکۆلیXIP بەکار بهێنیت بە یەک مۆدێم لەهەمان کاتدا.

# ئەو ڤایرۆسانەی بە فۆرماتیش لە ناو ناچن

هێدی کامران

یەکێک لە گەورەترین کێشەکانی بریتیە لە بونی ڤایرۆسەکان لە ناو کۆمپیوتەر چونکە بە شێوەیەکی گشتی بەکارهێنەر بێزار دەکەن ئەمە سەرەڕای لە ناوچونی زانیاری و بابەت وتێکچونی کۆمپیوتەر، تا ئێستا بۆ ڕێگە گرتن لە بڵاوبونەوەی ڤایرۆسەکان لە ناو کۆمپیوتەر چەندان جۆر لە دژە ڤایرۆس بەرهەم هێنراون بە تواناو کەفائەی جۆراو جۆرەوە، یان لە هەمو دەزگا ڕاگەیاندنە زانستیەکانیش باس لە چۆنیەتی خۆپاراسن لەم ڤایرۆسانە دەکرێت . ئەوەی ڕاستی بێت ڤایرۆسەکان لە تواناو زیان گەیاندن جیاوازن هەیانە توانایەکی کەمیان هەیە لە تێکدان وتێکشکاندنی بەرنامەکانی کۆمپیوتەر وە لە هەمان کاتدا تەمەنیشیان کورتە بەڵام کۆمەڵێکی تریش هەن کە بە شێوەیەکی گشتی دوای ساڵی ٢٠٠٠ دەرکەوتن ئەوانە تاکو ئێستاش نمونەی نوێترین جۆری ڤایرۆسن لە ڕێگای ئەنتەرنێت بڵاودەکرێنەوە زیانی گەورە بە کۆمپیوتەر دە گەیەنن هەندێکیان کۆمپیوتەر بە هەموو شتێکەوە لە کار دەخەن وە هەندێکیان کۆمپیوتەر توشی ڕیستارتی لە ناکاو دەکەن بەمەش دوبارە دەبێتە هۆی لەناوچونی زانیارو ئەو کارانەی کە ئەو کاتە بە کارهێنەر کاری لە سەر دەکات، لە گەڵ ئەم جۆرە ڤایرۆسانە جۆرێکی تریان هەن بە فۆرماتی کۆمپیوتەر لە ناو ناچن و دەمێنن هەر دوای فۆرمات کردن دەست بە کاری خۆیان دەکەن ئەمەش وا دەگەینێت کە ئێمە کۆمپیوتەرمان فۆرمات نەکردووە جا بۆ ئەوەی لەم کێشەیە ڕزگاریمان بێت و ئەم ڤایرۆسە پڕ مەترسیانە لە ناو ببەین پێویستە ئەم خاڵانەی خوارەوە پەیڕەو بکەین ئەگەر توشی یەکێک لە ڤایرۆسانە بوبوین چونکە ئەم جۆرە ڤایرۆسانە وا لێک دەدرێنەوە کە دەچنە ناو بایۆسەوە جا پێویستە کە:

١- سیدیەکی پاک بەکاربهێنین بۆ فۆرمات کردن وە دڵنیا بین کە پاکەو ئەو کۆمپیوتەرەی لێشی ئامادە کراوە ئەویش هەر بی ڤایرۆس بێت و پاک بێت.

٢- تەواوی هارد دیسک بەهەموو قورسەکانی فۆرمات دەکەین بەڵام نابێت فۆرماتێکی خێرا بێت.

٣- ڕاستەوخۆ دوای فۆرمات کردن کۆمپیوتەر بکوژێنەوە.

٤- پیلی مەزەبۆرد دەردەهێنین زۆر بە هێمنی بەبێ ئەوەی دەست کاری پارچەکانی تر بکەین .

٥- هێلی کارەبا بە کێبلەوە لە سەر کۆمپیوتەر دەبڕین .

٦- کۆمپیوتەر دادەگیرسێنین لە ڕاستیدا داناگیرسێت بەڵام خاڵکردنەوەیەکی کارەبایی تێدا ڕودەدات.

٧- کۆمپیوتەر دادەگیرسێنینەوە دوای ٤ کاتژمێر لە پاش دانانەوەی پیلی مەزەبۆردو بەستنەوەی کارەبایی.

٨- ئینجا ویندۆزو بەرنامەکانی تری وەکو دژە ڤایرۆس و بەرنامە پێویستەکان دادەمەزرێنین.

بەمەش لە کۆتاییدا کۆمپیوتەر پاک و بە تاڵ لە هەر ڤایرۆسێک ئامادە دەبێت.

# ٣٨ ڕێنمایی بۆ خێراکردنی کۆمپیوتەر




وێنەی (١)

**شاخەوان عمر حسن**
shakhawano@yahoo.com

**زنجیرەی سێهەم**

١٠ – پاس ۆرد یان شیفرەکردنی سیستەم:
کاتێک کۆمپیوتەر شیفرە کراوە یان بە پاس ۆورد شیفرە کراوە لەگەڵ ئەوەش هەندێک لە بەرنامەکان یان دیسک توپ شیفرە دەکرێت بەمەش دوبارە کاریگەری دەبێت لەسەر خێرایی کۆمپیوتەر چونکە ماوەی کردنەوەی نێوانیان یان نیە یان کەمە لەبەر ئەوەی لە پێشدا سیستەم دەکرێتەوەو داوای ژمارەی نهێنیت لێدەکات شیفرەکەی دادەنێیت بۆیە کاریگەری زیاترە بۆیەش ئێمە پێویستە کاتی گۆڕین و کردنەوەی هەردو شیفرەکە بگۆڕین . پێویستە ئەوەش بزانیت کە بەشی سیستەم لە کۆمپیوتەر وەکو ڕوحی کۆمپیوتەر وایە هەر هەڵەیەک بکەیت ئەوا کۆمپیوتەر دەوەستێت . بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیەش لە فەرمانی RUN دەچینە سەر REGEDIT ئینجا کلیک لەسەر HKEY_LOCAL_MACHINE پاشان بۆ سەر SYSTEM پاشان کلیک لەسەر CURRENTCONTROLSET لە دوایدا کلیک لەسەر CONTROL بڕوانە وێنەی (١)

پاشـان بە دوای MEMORY MANAGER دەگەڕێین کلیکی لەسـەر دەکەین بڕوانە وێنەی (٢) دەبینین لە بەشـی لای چەپی کۆمەڵێک فەرمانی هەیە لـە ناویاندا بە دوای ناوی DISABLEPAGINGEXECUTIVE دەگەڕێین کـە دۆزیمانەوە دوو کلیکی لەسەر دەکەین بۆکسێک دەکرێتەوە وەک لەوێنـەی (٣) دیـارە پاشـان نرخەکـەی دەکەیـن بـە ١ کە لە پێشـدا سـفر بووە ئینجا OK دەکەین و کۆمپیوتەر ریسـتار دەکەیـن، تا ئـەم کـردارەی ئەنجامان دا چالاک بێت .

١١- بچوک کردنـەوەو کەمکردنەوەی قەبارەی فایلەکان.

کەمکردنـەوەی قەبارەی فایلەکان زۆر کاریگـەری هەیـە لەسـەر خێـرا کردنی کۆمپیوتەر لە هێشـتنەوەی بەشێکی زۆر لە قەبارەی هارد دیسک بەمەش بوارێکی فراوانتـر دەداتە هـارد لە هەمان کاتدا لە سیسـتەمی ویندۆزی ئێکس پی خۆی لە خۆیـدا ئەم سیسـتەمەی تێدایە بەلام ناتوانێت هەمـوو فایلەکان بپەسـتێت و قەبارەیان کەم بکاتەوە بۆ نمونە فایلەکانی پاشـبەندی GIF یان JPEG چونکە ئەمانە لە سـەرەتادا پەسـتێنراون، جگە لەمەش کەمکردنـەوەی قەبارەی فایلـەکان تەنها سـودی بـۆ ئـەوە نیـە کـە قەبارەیـان بچـوک دەبێتـەوە بەلکو لە بـەر ئەوەش کە بەشـێکی ئەو فایلانە ڕێک دەخرێن و لـە گەڵ یەک کودەکرێنـەوەو ماندوبونی گـەڕان و ماندوبونـی دۆزینەوەیان کەم دەبێتـەوە لەهەمان کاتدا لە ونبونیشـیان بـێ مەترسـی دەبین کۆمەڵێـک بەرنامە هەن بۆ کەم کردنەوەی قەبارەی فایلەکان و لـە هەمویان گرنگ تـر بەرنامەی وین زیپـە WIN ZIP لـە ویندۆزی ئێکس پی ئەم خزمەت گوزاریە هەیە لە ژمارەکانی پێشوی گۆڤاری کۆمپیوتەر باس کراوە .

١٢ – بەرزکردنەوەی USB بۆ 2.0

ئەگەر چی ئێستا لە بازاردا ئەم قەبارەیە هەیـە بەلام ئێمـە بۆ ئـەوەی زانیاریتان هەبێـت لەسـەر ئەم سیسـتەمە باسـی دەکەین . USB کورتکراوەی UNIVERSAL SERIAL BUS زنجیـرە گوێـزەرەوەی گشتی لە پێشدا خێراترین USB دەگەیشتە ١٢ میگابایت لە چرکەیەکدا بەلام لەدوای داهێنانی USB 2.0 خێراییەکەی بوەتە چوار ئەوەندە واتە ٤٨ میگا بایت لە چرکەیەکدا . ئەگـەر کۆمپیوتـەری تـۆ USB 1.1 بێت واتە هێواشترین USB .




وێنەی (٢)




وێنەی (٣)




# ئاگاداربوون لە پشکنین و پێکهێنەرەکانی ئامێرەکەت Fresh Diagnose v3.50


**ئا / باوکی ماریا - شەقڵاوە**
Kameran7605@yahoo.com


ئەم بەرنامەیە دادەنرێت بە کارەکتەرێکی گشتگیرو تەواو بۆ دیاری کردن و پشکنینی ئامێری کۆمپیوتەر، وە ئەم بەرنامەیە زۆر زانیاری پێشکەش دەکات لەسەر پێکهێنەرەکانی ئامێرەکە، لە ڕووی بەرنامەکان و پێکهاتەکانی ناوەخۆ، وە یەکێکی تر لە تایبەتمەندیەکانی ئەم بەرنامەیە پێشکەش کردنی پشکنینێکی تەواو بۆ پێکهاتەکانی ناوەخۆ بۆ قیاس کردنی چەندیەتی توانای ئامێرەکە، وە لەکۆتاییدا بەرنامەکە هەڵدەستێ بە پێکهێنانی وێنەیەکی هێڵکاری بۆ جیاوازی کردن لەنێوان پارچە پشکنەرەکان لەگەل پارچەی تری بەرهەم هێنراوی بازاڕی کۆمپیوتەر، وە دەتوانین دەرئەنجامەکان

خەزن بکەین لە مەلەفێکی نووسین یاخود لاپەڕەیەکی ویب یان لاپەڕەی بەرنامەی وۆرد، وە هەروەها دەتوانین ڕاپۆرتێکی کامڵ پێک بهێنین لەسەر ئامێرەکەت بە شێوەی لاپەڕەیەکی ویب بە چەندین شێوەی جۆراوجۆر .

## باس کردنی بەرنامەکە

پاش دابەزاندنی بەرنامەکە بۆ سەر ئامێرەکەت، هەڵسە بەکردنەوەی بەرنامەکە، وە بەرنامەکە دەست دەکات بە کۆکردنەوەی زانیاری ووردو درشت لەسەر ئامێرەکەت، وە بۆ بینینی زانیاریەکان تەنها کلیک لەسەر دوگمەکانی سەرەوەی بەرنامەکە بکە، وەکو لەوێنەکەدا دیارە .

وە هەروەها دەتوانی زانیارییەکان ببینی لە لیستی لای چەپی بەرنامەکە .

## ڕوون کردنەوەی بەرنامەکە بە پێی ئەو ژمارانەی لەسەر وێنەکە دانراون

ژمارە ٦ :- دوگمەی زانیاری بەرنامەکانی سەر ئامێرەکەت، وە پێک هاتووە لە ١٠ بەش، یەکەمیان زانیاری بەرنامە کار پێکراوەکان، وە بەرنامە دابەزێنراوەکان، پاشان سیاسەتی ئامێرەکەو بەکارهێنەرەکان و زانیاری نێوخۆیی، پاشان کاتی ناوچەیی و پاشان فۆڵدەرە تایبەتیەکانی بەرنامەی کارپێکردنی درایڤەرەکان، فۆنتە دانراوەکان، مەلەفە سیستەمیەکان و هەموو مەلەفە دانراوەکانی سەر ئامێرەکەت، سیستەمی هاوپێچ بە سیستەمی کارپێکردن .

ژمارە ٧ :- دوگمەی زانیاری سیستەمی ئامێرەکە، وە پێک هاتووە لە ٣ بەش، زانیاری گشتی لەسەر ئامێرەکەت، زانیاری لەسەر یەکەی چارەسەرکردن، زانیاری لەسەر زاکیرە .

ژمارە ٨ :- دوگمەی زانیاری لەسەر ئامێرە هاوپێچ کراوەکانی لەتەک سیستەم، وە ئەمیش پێکهاتووە لە ٨ بەش، دیسکە نێوخۆییەکان، یەکەی پیشاندان، کیبۆرد و ماوس و پرینتەر و دەرچەکان، ئامێرە تایبەتیەکانی دانان، ئامێری پەیوەست بە سیستەمەکە لە ڕێگای سیستەمی پەیوەندی SCSI .

ژمارە ٩ :- دوگمەی زانیاری لەسەر تۆڕەکان و ئینتەرنێت، وە پێکهاتووە لە ٥ بەش، حاڵەتی ئینتەرنێت، تۆڕی پەیوەندی، زانیاری لەسەر بەرنامەی WINSOCK، بەکارهێنراو بۆ پێکهێنانی پرۆتۆکۆڵی TCP/IP، کە بەکار دەهێنرێت بۆ پەیوەندی کردن بە ئینتەرنێت لە سیستەمی ویندۆز، زانیاری لەسەر پەڕ هەڵدەرەوەی ئینتەرنێت، وە زانیاری لەسەر تۆڕی نێوخۆیی LAN ئەگەر هەبوو .

ژمارە ١٠ :- دوگمەی زانیاری لەسەر MULTIMEDIA، کە ئەمیش پێکهاتووە لە ٥ بەش، زانیاری لەسەر ئەدەواتی مەڵتیمیدیا، زانیاری دەست بەسەراگرتنی MCI، زانیاری دەربارەی DIRECTX دانراو لە نێو سیستەمەکە، زانیاری دەربارەی توانای وێنەیی DIRECTX، زانیاری دەربارەی توانای بەدەست هاتووی دەنگ .

ژمارە ١١:- دوگمەی زانیاری سەرچاوەی ئامێرە نێوخۆییەکان، کە پێکهاتووە لە ٤ بەش، زانیاری لەسەر داواکردنی پچڕانی IRQ، زانیاری لەسەر چوونی خێرا بۆ زاکیرە، وە زانیاری لەسەر دەرچەکانی هاتوو و دەرچوو، وە کۆتایی زانیاری لەسەر سەرچاوەکانی زاکیرە .

ژمارە ١٣:- دوگمەی تاقی کردنەوەو دەرئەنجام، ئەم بەشە دیاری بکە کە دەتەوێ زانیاری لەسەر بەدەست بخەیت، وە کلیکی دوگمەی ژمارە ١٤ بکە، دوایی چاوەڕێ بکە تا دەرئەنجامەکان کۆتاییان دێت، بەڵام هەڵمەستە بە جوڵاندنی ماوس و کیبۆرد تا دەرەنجامەکە تەواو دەبێت، چەند دەقیقەیەک دەخایەنێت وە دەرئەنجامی زانیاریەکەت پیشان دەدات، وە ئەمیش لە ٧ بەش پێکهاتووە، تاقی کردنەوەی پرۆسێسەر، سیستەمی مەڵتیمیدیا، کارپێکەری دەرخستن و پیشاندان، تاقی کردنەوەی زاکیرە، دیسکەکانی نێوخۆیی و دیسکی داچێنراو، تۆڕی نێوخۆیی ئەگەر هەبوو .

بۆ پێکهێنانی ڕاپۆرتێکی کامڵ لەسەر ئامێرەکەت کلیکی دوگمەی ژمارە ٥ بکە، پەنجەرەیەکت بۆ بەدیار دەکەوێت جۆری ئەو زانیاریەی دەتەوێ لەگەڵ ڕاپۆرتەکە بێت دیاری دەکەیت لەگەڵ ناونیشانی ڕاپۆرتەکە، وە کلیک لەسەر BUILT دەکەین، وە ئەگەر بمانەوێ شێوەی ڕاپۆرتەکە بگۆڕین کلیکی STYLE دەکەین .

وە هەروەها دوگمەی ژمارە ١ بەکاردێت بۆ نوێ کردنەوەی زانیاری بەرنامەکە، وە ژمارە ٢ بۆ چوون بەرەو ئاستێکی بەرزتر لە لیستی لای چەپ، وە ژمارە ٣ بۆ پاراستنی دەرەنجامەکان، وە دوگمەی ژمارە ٤ بۆ پرینت کردنی دەرەنجامەکان .



وێنەی (١)

# چۆنیەتی گۆڕینی فۆرماتی وێنە بە بەکارهێنانی RIGHT CLICK IMAGE CONVERTER

ئا/ هیمداد عمر ئیسماعیل
himdad_2005@yahoo.com

ئەم بەرنامەیە زۆر بە سوودە بۆ گۆڕینی فۆرماتی وێنە بۆیە بەپێویستم زانی کورتە باسێکی بکەم دەربارەی چۆنیەتی کارکردنی ئەمیش بەدوو ڕێگا دەتوانین کاری پێبکەین:

یەکەم- سەرەتا دەچینە START دوایی ئەچینە PROGRAMS دواتر ئەچینە RIGHT CLICK IMAGE CONVERTER وەک لە وێنەی ژمارە (١) ڕوون کراوەتەوە.

١- کلیک لەسەر ADD FIL دەکەین لەوێ ئەتوانین وێنەکان بهێنین بۆ ناو بەرنامەکە.

٢- لە OUT PUT جۆری فۆرمات هەڵدەبژێرین.

٣- لە RESIZE قەبارەی وێنەکە دیاری دەکەین.

٤- کلیک لەسەر CONVERT دەکەین بۆ ئەنجام دانی کارەکەمان تێبینی: کارەکەمان لەشوێنی سەرەکی SAVE دەبێت.

٥- کلیک لەسەر REMOVE FILS دەکەین بۆ سڕینەوەی وێنەکان لە ناو بەرنامەکە لە وێنەی ژمارە(٢) زیاتر ڕوون کراوەتەوە.



دووەم- ئەمەش ڕێگایەکی زۆر ئاسانە سەرەتا وێنەکان دیاری دەکەین پاشان RIGHT کلیک لەسەر وێنەکان دەکەین دەچینە سەر RIGHT CLICK IMAGE CONVERTER لیستێک دەبێتەوە لەوێ جۆری فۆرماتەکە هەڵدەبژێرین پەنجەرەیەکی بچوک دەبێتەوە دەبێت کلیک لەسەر YAS بکەین وەک لەوێنەی ژمارە (٣) ڕوون کراوەتەوە.

وێنەی (٢)



وێنەی (٣)

# بۆ ئەو کەسانەی کە چاویان کەم بینایە



وێنەی (١)

ئا: هاوکار رەحمان

ئەو کەسانەی کەچاویان کەم بینایە توانایان نیە زۆر سەیری کۆمپیتەرەکەیان بکەن و کاری پێ بکەن بۆیە سەرەنجتان رادەکێشین بۆ ئەم بابەتە.

لەسەر کیبۆردەکە دوگمەی ALT + SHIFT+ PRINT لێ بدە ئەم وێنەیە دەردەکەوێت (وێنە١)

پاشان دوگمەی OK دابگرە دەبینین جۆری رەنگەکەی دەگۆرێت بۆ پێچەوانەی رەنگەکان (وێنە٢)

هەروەها لە وۆردیش بەهەمان شێوە دەتوانن ئەو فەرمانە بەکار بێنن (وێنە٣).

ئەنجام دانی ئەم کارە باشترە بۆ پاراستنی چاوەکانت و ئەزیەتی چاوەکانت نادات زۆر بەئاسانی دەتوانیت بەکاری بێنی.




وێنەی (٣)




وێنەی (٢)

# گۆڕینی ڤیدیۆی 3GP بۆ MPEG لە بەرنامەی(Xilisoft 3GP Video Converter)




وێنەی (١)

ئا: کۆسرەت دلشاد
kh_venos@yahoo.com

ئەم بەرنامەیە زۆر بەسودە بۆ ئەو کەسانەی دەیانەوێت ڤیدیۆیی (3GP)بگۆڕن بۆ (MPEG) یان تۆ ڤیدیۆ یەکی مۆبایلت هەیە کە شەپۆڵەکەی بەشێوەی(3GP) یـــان(MP4) دەبێت دەتـــەوێ بیگۆڕی بۆ(MPEG) تا لە بەرنامەی(REALPLAYER) یـان لـە بـەرنـامـەی(WINDOWS MEDIA PLAYER) بیبینی یانیش بیکەی بە سی دی تا لە ڤیدیۆ سی دی بێ گرفت ئیش بکات دەتوانی لە ڕێگای ئەم بەرنامەیە شەپۆڵەکەی بگۆڕی بۆ (MPEG).

پاش دابەزاندنی بەرنامەکە دەچینە لیستی(START) پاشان بۆ (PROGRAMS) لەوێش دەچینە سـەربـەر نامەکە وەک وێـنـەی(١)، کەبـەرنـامـەکـە بـۆوە وەک وێنەی(٢)، ئینجا کارەکەمان دەکەین.

١- لـەسـەر فرمانی (ADD)کرتـەیـەک دەکـەین بۆ هێنانی ڤیدیۆیەکە بۆ ناو بەرنامەکە لەوێنەی (٣) زۆر بەجوانی ڕون کراوەتەوە.

٢- ڤیدیۆیەکە دیـاری دەکـەین واتە (SELECT) لە وێنەی (٣) زۆر بەجوانی ڕون کراوەتەوە.

٣- جۆری شەپۆڵەکە هەڵئەبژێرین لە (PROFILE) لە وێنەی (٣) زۆر بەجوانی ڕون کراوەتەوە.

٤- لە (BROWSE) شوێنی ڤیدیۆیەکە

هەڵئەبژێرین کە شەپۆلەکەی گۆڕا بچێتە ئەوێ لە وێنەی (٣) زۆر بەجوانی ڕون کراوەتەوە.

٥- لە کۆتایی دا کورتەیەک لەسەر فرمانی (ENCODE) دەکەین پەنچەرەیەکمان پیشان ئەدات داوای ناو و ووشەی نهێنیمان لێدەکات (SERIAL) ئەکات، ناوێک دەنوسین و ووشە نهێنیەکەش دەنوسین کە دەبێ ووشە نهێنیەکە لەگەڵ بەرنامەکە هەبێت دوایی (OK) دادەگرین سیگنەڵێک پڕ دەبێ و چیتر داوای ووشە نهێنیەکە ناکات دوایی دەچینە شوێنەکەی کە دیاریمان کردبوو ڤیدیۆیەکە بچێتە ئەوێ دەبینین ڤیدیۆیەکە دروست بووە بەو شەپۆلەی کە خۆمان دابو مانێ وە لە ڕێگەی ئەم بەرنامەیە دەتوانین شەپۆلی (3GP) بگۆڕین بۆ (3G P2.AVI.DIVX.MPEG.MP2.MP3.MP4.WA وە بە پێچەوانەشەوە.




وێنەی (٢)

وێنەی (٣)